# قەیرانی دارایی جیهانی ۲۰۰۸

## و چارەسەری لە سیستەمی ئابووری ئیسلامی دا






سەردار عوسمان خدر
عامر عەبدوڵا مەجید

۱٤۳۰ك
۲۰۰۹ز

# قەیرانی دارایی جیهانی 2008

## وچارەسەری لە سیستەمی ئابووری ئیسلامی دا

سەردارعوسمان خدر

عامر عەبدوڵا مەجید

1430کۆچی

2009ز

# ناوەڕۆک

# سەرەتا

ئەمرۆ جیهان ڕووبەڕووی قەیرانێکی دارایی ترسناك بۆتەوە، سەرچاوەی ئەو قەیرانەش لە، وولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا سەری هەڵداوە کە هەندیك تویژەر بە دڵی سیستەمی سەرمایەداری دادەنێن و بە زەبەلاح ترین هیزی ئابووری جیهانیش هەژماردی دەکەن.

هەروەها بە پێی یەکیك لە ڕاپۆرتەکانی سندوقی نەختی نێودەوڵەتییەوە لەنێوان ساڵانی(1980-2002) زیاتر لە $\left(\frac{2}{3}\right)$ی ئەندامانی ئەو سندوقە ڕووبەڕووی قەیرانی ئابووری بوونەتەوە.

دیارە قەیرانی دارایی جیهانی (2008) لە ئەمەریکاوە بۆ وولاتانی ئەورووپا و ئاسیا و سەراپای وولاتانی جیهان تەشەنەی کردووە، واتە وولاتانی جیهانی سێیەمیش لە ئاسەوارە نێگەتیڤەکانی ئەو قەیرانە بێبەش نەبووینە، لە نیو ئەو وولاتانەش عێراق دێت، کەواتە هەرێمی کوردستانیش زۆر و کەم بەشی خۆی لە ئاسەوارە نێگەتیڤەکانی ئەو قەیرانەی بەر کەوتووە. هەروەها دیدی سیستەمی ئابووری ئیسلامییمان لە بارەی هۆکارەکانی ئەو قەیرانە ترسناکە لە لایەك، ولە لایەکی دیکە، لەگەڵ چارەسەر کردنی ئەو قەیرانە بە پێی ئەو سیستەمەخستۆتە ڕوو.

بۆیە لیرەدا پێمان باشە سوپاسێکی بێپایان ئاراستەی بەرێز(د.بەختیار سابیر مەحەمەد )بکەین،کە ئەرکی پێداچوونەوەی ئەم نامیلکەیەبی گرتە ئەستۆ بە هەمان شێوە سوپاسێکی لە رادەبەدەر ئاراستەی مامۆستای بەرێز(ئەیوب سماقەیی)دەکەین،کە هەردەم هاوکار وهاندەری یەکەمان بووە بۆ تەواو کردنی ئەم کارە.

لە کۆتاییدا لە میانەی ئەم نامیلکەیە چەند زانیاریەکی سەرەتایی و سادە لە بارەی قەیرانی داراییەوە دەخەینە ڕوو، هیوادارین سوود بەخش بێت.

## یەکەم

## چاوپێخشاندنێك بە بازاڕی کاغەزە داراییەکان

سەرەتا پێش ئەوەی ئاماژە بە قەیرانی دارایی جیهانی ساڵی 2008 بکەین، دەبێ ئاماژەیەکی کورت بە بازاڕی کاغەزە داراییەکان بکەین چونکە بەشێکە لە پێکهاتەی ئەو قەیرانە، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە:

1-مێژووی بۆرسەکان:Date Of Financial Markets

ئیتالییەکان بۆ یەکەم جار بۆرسەیان دامەزراند، زاراوەی بۆرسەش لە داتاشراوی ناوی بازرگانێکی دەوڵەمەندی ئیتالی هاتووە، ئەویش ناوی(ڤان دین بورس) بوو. ئەو بازرگانەش خاوەنی میوانخانەیەك بووە، لە شاری بریجی وولاتی بەلجیکا، کە شوێنی بە یەکگەیشتنی بازرگانەکان بووە لە سەدەی پانزەهەمدا.

دستپێکی ناوەندی مامەڵە دارایی وبازرگانییەکانی لە سەرەتای سەدەی شانزەهەم بۆرسەی ئەنڤرس لە بەلچیکا بووە. هەروەها بۆرسە بۆ یەکەم جار لە ساڵی 1695 لە لندن دامەزرا، دواتر لە ساڵی 1762 لە ڤێنا و لەساڵی 1792 لە نیۆیورك، ولەساڵی1801 لە برۆکسل، و لە ساڵی1822 لە رۆما دامەزراوە.

2-پێناسەی بۆرسە: The Definition Of Financial Markets

بۆرسە ئەو شوێنەیە کە تیایدا ئالوویری هەبووە داراییەکانی تیدا ئەنجام دەدرێت، واتە لێشاوی دارایی لە یەکەکانی پاشەکەوت بۆ یەکەکانی وەبەرهێنان سەرچاوە دەگرێت، کە دارایی دەگوازێتەوە لەو یەکانەی کە زێدەی داراییان هەیە و هەلی وەبەرهێنانی پێویستیان نییە، بۆ بەکارهێنانیان لەو یەکانەی کە هەلی

وەبەهێنانییان هەیە، بەڵام دارایی پێویستیان بۆ هەلەکانی وەبەرهێنان نییە بەو جۆرە هاوسەنگی لە ئالوویری دارایی دێتە دی کە شوێنەکەی بۆرسەیە.

3-پۆلێن کردنی بۆرسەکان: Classification Of Financial Markets

دەتوانین پێکهاتەی بۆرسەکان بۆ سێ بەش دابەش بکەین:

ا-بازاڕی سەرمایە: بە شێوەیەکی سەرەکی لە بازاری پشك و قەواڵەکان پێك دێت، کە ئالوویری ئامرازەکانی دارایی و قەرزە مام ناوەند و قەرزە ماوە درێژەکانی تێدا ئەنجام دەدرێت.

ب-بازاری دارایی: ئالوویرەکانی ئامرازی دارایی و قەرزی کورتخایەنی تێدا ئەنجام دەدرێت.

ج-بازاری دراوە بیانییەکان: کڕین و فرۆشتنی دراوە بیانییەکانی تێدا ئەنجام دەدرێت.

هەروەها بۆرسەکان لە بازاڕی مامەڵە نەختییەکان یان بازاری داتاشراوەکان (مام ناوەندی) پێك دێن. هەرچی لە بازاڕی مامەڵەی نەختییە، ئەوا ئالوویری وەبەرهێنان و قەرزەکان و پشك وقەواڵەکانی تێدا ئەنجام دەدرێت، و دانە دەستیش یەکسەرە. بەڵام بازاڕی داتاشراو لە سەوداکانی ئایندە وکردەکانی ئالوویری دراو پێك دێت.

4-ئامرازەکانی سەرمایە: Tools Capital

کە بریتیین لە سەرمایەیی خاوەنداریەتی و سەرمایەیی قەرزدەر. دەتوانرێت ئامرازەکانی بازاڕی دارایی بۆ ئەم بەشانەی خوارەوە دابەش بکەین:

ا-ئامرازی پشکەکانی سەرمایە. Tools Of Share Capital

ب-پشکە نایابەکان. Preferred Shares

ج-ئامرازەکانی قەرز وەك قەواڵەکان. Tools Loans

د-ئامرازی تێکەڵاو: Tools Hybrid

هـ-ئامرازە داتاشراوەکان: Derivatives

ئەمە بەکارناهێنرێت بۆ سەرمایەیی ماوە درێژ، بەڵکو قەرزدەرو وەبەرهێنەکان بۆ بەڕیوەبردنی تێچوون و هەیکەلی پارەدارکردن بەکاری دەهێنن.

دەتوانین پێکهاتەکانی بۆرسەش لەمیانەی هێڵکاری(1) روون بکەینەوە:

هێڵکاری(1)

پێکهاتەکانی بازاری دارایی روون دەکاتەوە




5-بۆرسە ناوخۆیی و نیودەوڵەتییەکان:

ا-بۆرسە ناوخۆییەکان: Domestic Financial Markets

بۆرسە ناوخۆییەکان بازاڕی نیشتمانییە، بە مەبەستی پارەدارکردنی کۆمپانیاکانی سەرمایە لە ناوخۆی وڵات دامەزراوە، ئەو بازارەش بە پێی یاسا و رێساکانی ئەو وڵاتە کار دەکات. هەروەها ئەو کەسانەی مامەڵەشی تیدا ئەنجام دەدەن بریتین لە هاووڵاتییەکانی ئەو وڵاتە.وەك بازاڕی بەغداد بۆ کاغەزی دارایی.

ب-بۆرسە نێو دەولەتیەکان: Global Financial Markets

ئەو جۆرە بۆرسانە لە سەر ئاستی نێودەوڵەتی کار دەکەن، وەبەرهێنەکانیشی هاووڵاتی چەندان وڵاتن. هەروەها ئەو جۆرە بازارانەش نا کەوێتە ژێر رکێفی لایەنی ناوخۆی هیچ وولاتێکەوە.لێرەدا سێ ناوچەی جوگرافی بۆ بۆرسە نێودەوڵەتییەکانەوە بەرچاو دەکەوێت:

ا-بۆرسەکانی ئەمەریکا:

وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بە پلەی یەکەم دێت لە رووی بۆرسەکاندا، کە زۆرترین ژمارەی کۆمپانیای تۆمار کراو لە خۆ دەگرێت لە لیستی نرخی بۆرسەکاندا. وگرنگترین و بەناوبانگترین بۆرسە لە ئەمەریکا بریتییە لە بۆرسەی نیویۆرك.

ب-بۆرسەکانی ئەورووپا:

-بۆرسەی لەندەن:ئەو بۆرسەیە بە بازاری یەکەم لە رووی ژمارەی پشکەوە دادەنرێت .

-بۆرسەکانی فەرەنسا:ئەو وولاتە خاوەنداریەتی حەوت بۆرسە دەکات، کە بریتیین لە بۆرسەکانی(پاریس، بۆردۆ، لیل، لیۆن، مارسیلیا، نانسی، نانت).

-بۆرسە ئەڵمانییەکان:بۆرسەکانی ئەڵمانیا بچوکن بە بەراورد کردن لەگەڵ ئابوورییەکەیدا و بۆرسەکانیشی پەیوەستە بەبەنکەکانەوە. لە گرنگترین بۆرسەکانیشی بۆرسەی فرنکفۆرتە.

ج-بۆرسەکانی ئاسیا:هەر دوو بۆرسەی تۆکیۆ و هۆنگ کۆنگ لە ئاسیا بە پلەی یەکەم دێن لە رووی قەبارەی ئالوێری یەوە، بێجگە لە بوونی بۆرسە لە مالیزیا و چین و هیند... هتد.

6-ئاماژەی بۆرسە جیهانییەکان(مؤشرات الاسواق المالیە العالمیە)

ئاماژەی بازاڕی دارایی، یان ناوەندی(ژمارەی پێوانەیی): بریتییە لە بەهای ژمارەیی، کە گۆرانکاری لە بازاڕی دارایی پێدەپێورێت. ئەویش بە ریژەی سەدی گۆرانکاری رۆژێك دیار دەکات بە بەراورد لەگەڵ ماوەی بنەرەتی، یان خاڵی دەستپێکردنی کاری بۆرسە لەو رۆژەدا.

هەروەها بیرۆکەی بنەرەتی ئاماژەی بۆرسەکان لەوە هاتوە هەر کۆمپانیایەك کە لە کەرتێکی ئابووری چالاکی ئەنجام دەدات، بەئەمانەت وراستگۆیی باری بازاڕ دەخاتە روو، لەو کەرتە ئابوورییەی کە نوینەرایەتی دەکات.

لێرەدا هەوڵ دەدەین چەند ئاماژەیەکی بۆرسە جیهانییەکان بخەینەروو:

1-ئاماژەی داوجونز: Dow-Jones

دامەزراندنی ئەو ئاماژەیە بۆ ساڵی1896 دەگەرێتەوە، کە لەلایەن هەریەك لە(چارلز داو)و(ئیدوارد جۆنز) دامەزرا، ئەو ئاماژەیە یەکەم ناوەند بوو، بۆ نرخی پشکە نایابەکانی بازاڕی کاغەزە داراییەکانی نیۆیورك، ئەو کاتە ئەو ئاماژەیە لە(12)کۆمپانیا پێك هاتبوو. بەڵام ئیستا لە(30) کۆمپانیای گەورە لە بوارەکانی کەرتی پیشەسازی و خزمەتگوزاری تەکنەلۆژیا پێك هاتووە.

ب-ئاماژەی(ئێس ئاند پی): S&P 500

:ئەو ئاماژەیە پێوەریکی بەر فرەوانە بۆ سەراپای بازاڕ، لە ژمارەیەکی زۆری کۆمپانیاکان پیك دێت. کە دەگاتە(500)کۆمپانیا. لەو ئاماژەیەدا گرنگی کۆمپانیا گەورەکان جیاوازە لەگەڵ کۆمپانیا بچووکەکانەوە. هەروەها ئەو ئاماژەیە سێ لە سەر چواری سندوقەکانی وەبەرهێنان لە ئەمەریکا پێك دەهێنێت.

ج-ئاماژەی تایتانز:TITANZ

ئەو ئاماژەیە لە ساڵی 2004 دامەزراوە، کە بریتییە لەپشکی کۆمپانیا گەورەکانی جیهانی عەرەبی، وپێك هاتووە لە پشکی(50) کۆمپانیای گەورە، لە(10)وولاتی عەرەبی کە بریتیین لە وولاتانی (بەحرین، میسر، ئوردن، لبنان، کویت، مەغریب، تونس، ئیمارات، قەتەر).

د-ئاماژەی فایناشال تایمز: FT-SE100

ئەو ئاماژەیە لە لایەن رۆژنامەی فایناشال تایمز ژمار دەکرێت، کە لە لەندەن دەردەچێت، و ژمارەی (100)یش بریتییە لە ژمارەی ئەو کۆمپانیایانەی کە دەچنە نێو ئەو ئاماژەیە لە بۆرسەی لەندەندا.

ئەو مەرجانەی کە پێویستە لەپشکی کۆمپانیاکان هەبێت تا بچێتە نێو ئەو ئاماژەیە بریتین لە:

1-پێویستە کۆمپانیاکە کۆمپانیایەکی پشکداری گشتی بێت.

2-پێویستە بارەگاکەی لە بەریتانیا بێت.

3-پێویستە(25%)ی پشکەکانی بۆ خەڵك خرابێتە روو.

هـ-ئاماژەی نیکای:Nikkei 225

گرنگترین ئاماژەکانی بازاڕی پشکەکانە لە ژاپۆن، ئەو ئاماژەیەش لە ساڵی1950 دەستی پێکرد، و ژمارەی کۆمپانیاکانی (225) کۆمپانیایە. جێی وەبیر هێنانەوەشە ئاماژەی دیکەش هەیە بە ناوی نیکای لەوانە: نیکای (300)، ونیکای ستایل ئەندکس.

و-ئاماژەی کاك 40: CAC40

بۆرسەی پاریس هەڵدەستێ بە ژمار کردنی ئەو ئاماژەیە، بۆیە پێ ی دەوترێت کاك 40 چونکە ژمارەی ئەو کۆمپانیایانەی کە ئالوویێری پشکەکانیان دەکەن دەگاتە (40) کۆمپانیا.

ز-ئاماژەی داکس 30: DAX30

ئاماژەیەکی ئەڵمانییە، و پشکەکانی (30) کۆمپانیای تێدا ئالوێر دەکرێت، لەم ئاماژەیەدا تەنها ئەو کۆمپانیایانەی مامەڵەی ئەلکترۆنی دەکەن دەتوانن بەشداربن، بۆ زانینیش بازاڕی پشکەکانی ئەڵمانیا یان مامەڵەی ئەلکترۆنییە یاخود مامەڵەی ئاساییە. هەروەها ئەو ئاماژەیە نرخی (30) لە گەورە کۆمپانیاکانی ئەڵمانیای لە بۆرسەی فرانکفۆرت تێدا ئالوویر دەکرێت.

7-ئاماژەی بۆرسەی وولاتە عەرەبییەکان:

بەحرین(BSE) ، میسر(CMA) ، توردن(ASE) ، کوێت(KSE) ، لوبنان(BSI) مەغریب،(MASI)، عومان(MSM) ، فەلەستین-AL) QUDS)، قەتەر(CBQ) ، سعودیە(NCFEI) ، تونس(BVMT) ، ئیمارت (NBAD)

8-بۆرسە بەناوبانگەکانی جیهان:

ا-بۆرسەی نیویۆرك: New York Financial Market

بۆرسەی نیویۆرك كە دەكەوێتە وول ستریت، تاوەكو ئەمرۆ بە گەورەترین بۆرسە لە هەموو جیهان دادەنرێت. هەندێ جار لە لایەن ئەو كەسانەی كە ئالوویری تێدا ئەنجام دەدەن پێ ی دەوترێت بیگ بۆرد (Big Board)، كە ئەمەش ماناكەی یەكسانە بە بۆرسەی نیویۆرك، لەو بۆرسەیەدا بازارێك بۆ ئالوویری كاغەزە داراییە حكومییەكانی ئەمەریكا و پشك و قەواڵە بازرگانییەكان هەیە. هەروەها ئالوویری پشكەكان لە ناو بازنەی بۆرسەی نیویۆرك ئەنجام دەدرێت، بەڵام ئالوویری كاغەزە داراییە حكومییەكانی ئەمەریكا لە دەرەوەی بۆرسەكە ئەنجام دەدرێت.

ب-بۆرسەی ناسداك: Financial Market Nasdaq

ناسداك بریتییە لە سیستەمێكی ئالوویری دارایی دەرەوە، كە لە ساڵی 1971 لە ئەمەریكا پەیدا بوو. ئەم بۆرسەیەش بە دووەم گەورەترین بۆرسە لە وولاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا دادەنرێت، جێی ئاماژە پێكردنە ناسداك شوێنێكی دیاریكراوی نییە، بەڵكو بریتییە لە سیستەمێكی كۆمپیوتەری گەورەی بە یەكەوە بەستراو، بە یارمەتی تۆری جاڵجاڵوكەی جیهانییەوە (WWW) تیایدا بەشداربووان لە رێگای ئامێرەكانیانەوە لە سەرانسەری جیهان بەشداری تێدا دەكەن.

ج-بۆرسەی تۆكیۆ: Tokyo Financial Market

لەو بۆرسەیەدا ئالوویری كۆمەڵێكی جۆراوجۆر لە كاغەزە داراییەكان ئەنجام دەدرێت، وەك پشك و قەواڵەكانی بازرگانی و قەواڵە حكومییەكانی ژاپۆن. ئەمە ومامەڵەكانی ئالوویر لە كڕین و فرۆشتن لە رێگای ئەلكترۆنییەوە ئەنجام دەدرێت.

د-بۆرسەی هۆنگ كۆنگ: Hong Kong Financial Market

ئەو بۆرسەیەش بە یەکێك لە بۆرسە گەورەکانی ئاسیا دادەنرێت، کە تیایدا ئالوویری پشك و قەواڵەکان و کاغەزە داراییەکانی دیکەی تێدا ئەنجام دەدرێت.

هـ-بۆرسەی لەندەن: London Financial Market

ئەو بۆرسەیە بازاڕێکی ناوەندییە بۆ ئالوویری کاغەزە داراییە حکومییەکانی بەریتانیا(پشکە زامنەکان)، هەروەها بازاری ئالوویری پشك وقەواڵە بازرگانییەکانیشە. جێی وەبیر هێنانەوەیە لەو بۆرسەیەدا دوو بازار بە ڕێوە دەبرێت، ئەویش بازاڕی سەرەکی کۆمپانیا تۆمارکراوەکان و بازاڕی کۆمپانیا بچوکەکانە، کە ناسراوە بە بازاڕی وەبەرهێنانی جێگرەوە.

و-بۆرسەی فرنکفورت: Frankfurt Financial Market

ئەو بۆرسەیە بە گەورەترین بۆرسەکانی ئەڵمانیا دادەنرێت، لەو بۆرسەیەدا پشکەکانی گەورەترین کۆمپانیاکانی وەبەرهێنان تۆمار دەکرێت. هەروەها پشکەکانی پلەی دووەم و سێیەم هەر لەو بۆرسەیەدا مامەڵەی پێدەکرێت.

## دووەم

## پێناسەی قەیرانی دارایی، جۆرەکانی، هۆیەکانی

1-پێناسەی قەیرانی دارایی: Financial Crisis

بریتییە لە دابەزینی لە ناکاوی هەبووەکانەوە، هەبووەکانیش بریتییە لە سەرمایەیی مادی، یان سەرمایەیی دارایی، یاخود کاڵای ئاخنراو، ئەمانەش وەك:پشکەکان، وژمێرکاری پاشەکەوت، وداتاشراوە داراییەکانەوە (گرێبەستەکانی ئایندە بۆ نەوت ودراوە بیانییەکان). ئینجا ئەگەر هاتوو لە ناکاو بەهای ئەو

هەبووانە دابەزی واتە ئیفلاس کردن وهەرەسهێنانی بەهای ئەو دامەزراوانەی کە خاوەنداریەتی ئەو هەبووانە دەکەن، بەمەش دەبێتە هۆی ڕوودانی قەیرانی دارایی.

کەواتە قەیرانی دارایی شێوەی هەرەسهێنانی لە ناکاو لە بازاری پشکەکان، یان دراوی بیانی، یان لە بازاڕی زەوی وخانوو، یاخود کۆمەڵێك لە دامەزراوە داراییەکان لە خۆ دەگرێت، ئینجا درێژ دەبێتەوە بۆ سەرجەم کەرتەکانی دیکەی ئابووری.

هەروەها بە شێوەیەکی دیکە دەتوانین قەیرانی دارایی بەوە پێناسە بکەین کە بریتییە لە بەرز بوونەوەو نزم بوونەوەی لە ناکاو کە کاریگەریان بەشێوەی بەشەکی یان هەمووەکی لە سەر سەرجەم گۆڕاوە داراییەکانەوە هەیە، وەك(قەبارەی پشك وقەواڵەکان، تێکرای ئالووێر).

ئاشکرایە کاتێك قەیرانی دارایی بەشێوەی لەناکاو ڕوودەدات هۆکارەکەی لە ئەنجامی قەیرانی متمانەی سیستەمی دارایی دایە، هۆیە سەرەکییەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ لێشاوی سەرمایە بۆ ناوخۆ بە بەردەوامی، هاوکات فرەوان بوونێکی لە ڕادەبەدەر لە قەرز دان، بەبێ ئەوەی ڕەچاوی توانای دانەوەی قەرز کەرەکان بکرێت، کاتێکیش بەهای دراوی وڵات دادەبەزێت، ئەوا لێشاوی سەرمایە ڕوو لە دەرەوە دەکات .

2-جۆرەکانی قەیرانی دارایی: Types Of Financial Crisis

دەتوانین جۆرەکانی قەیرانی دارایی بۆ سێ جۆر پۆلین بکەین:

أ-قەیرانی دراوی بیانی: Foreign Currency Crisis

قەیرانی دراوی بیانی ئەو کاتە ڕوودەدات، کاتێك جامبازەکانی دراو هێرش دەکەنە سەر دراوی وڵاتێك لەناکامدا دەبێتە هۆی دابەزینێکی بەرچاو لە بەهای

دراوەکە، یان بەنکی ناوەندی ئەو وولاتە ناچار دەبێت بەرگری لە دراوەکەی بکات، ئەویش لە ڕێگەی یەدەگە دراویەکانییەوە، یان بەرزکردنەوەی نرخی سوود بەشێوەیەکی بەرچاو و بە ڕێژەیەکی گەورە.

ب-قەیرانە بەنکییەکان: Banking Crisis

قەیرانە بەنکییەکان ڕوودەدەن کاتێك پاڵنەری سەرەکی بۆ کێشانەوەی سپاردە دەست پێ دەکات، یان حکومەت ناچار دەبێت دەست تێبخات، ئەویش لە ڕێگەی پاڵپشتی داراییەوە بۆ بەنکەکانەوە. هەروەها ئەو جۆرە قەیرانە ماوەیەکی درێژ دەخایەنێت بە بەراورد بە قەیرانی دراوەوە، وکاریگەری گەورەشی لە سەر چالاکی ئابووری دەبێت. ئەو جۆرە قەیرانە لە پەنجا وشەستەکانی سەدەی بیستەم زۆر کەم ڕوویان دەدا، بەهۆی بوونی ئاستەنگ لە بەر دەم گواستنەوەی سەرمایە. بەڵام لە هەفتاکانەوە تا ڕۆژی ئەمرومان ئەو جۆرە قەیرانە بەشێوەیەکی بەر بڵاو ڕوودەدەن.

ج-قەیرانی قەرزەکان: Debt Crisis

قەیرانی قەرزەکان کاتێك ڕوودەدات گەر وولاتێك نەتوانێت قەرزەکانی سەری بداتەوە، یان لایەنی قەرزدەر وای بۆ دەچێت کە ئەو وولاتە ناتوانێت قەرزەکەی بداتەوە، بەمەش قەرزی تازەی پێشکەش ناکات، لەهەمان کاتدا هەوڵی وەرگرتنەوەی قەرزەکانی خۆی دەدات. هەروەها قەیرانی قەرزەکان بەستراوەتەوە بە قەرزی بازرگانیەوە(تایبەت)، یان قەرزی سیادییەوە(گشتی). مەترسی چاوەڕوانکراویش بریتییە لەوەی کە کەرتی گشتی نەتوانێت قەرزەکانی بداتەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی دابەزینێکی گەورە لە لێشاوی سەرمایە بۆ ناوخۆی ئەو وولاتە، هەروەها دەبێتە هۆی قەیرانی ئالوێری بیانی.

د-قەیرانی گشتگیر: Global Crisis

ئەو قەیرانەیە، کە لە یەك کاتدا رووبەرووی سیستەمی دارایی ونەختی دەبێتەوە، ئەمەش کاریگەریەکی نێگەتیڤی لە سەر تێکرای گەشەی ئابووری دروست دەکات.

3-هۆیەکانی سەرهەڵدانی قەیرانی دارایی: Causes Of Financial Crisis

دەتونین هۆکارەکانی سەرهەڵدانی قەیرانی دارایی دابەش بکەین بۆ دوو کۆمەڵە کە بریتییە لە:

ا-ئەو هۆکارانەی دەبنە هۆی سەرهەڵدان وجوڵەی قەیرانی دارایی کە ئەمانیش بریتین لە:

-کورتهێنانێکی گەورە لە هاوسەنگی بازرگانیدا.

-دابەزینێکی گەورە لە بەرهەمداریدا.

-دابەزینی قەبارەی یەدەگی دراوە بیانیەکان.

-لاوازی چاودیری بەنکی ناوەندی لە سەر بازاڕی دراوی بیانی، و بەنکەکان.

-ترسی وەبەرهێنەکان لە دابەزینی نرخەکاندا.

ب-ئەو هۆکارانەی دەبنە هۆی زیاتر خێراکردنی قەیرانی دارایی کە ئەوانیش بریتیین لە:

-گەورەیی قەبارەی قەرزی دەرەکی کورت خایەن، کە پێشکەش بە کەرتی تایبەت دەکرێت.

-لاوازی چاودیری بەنکی ناوەندی.

-دابەزینی چالاکی بەنکەکان.

-بەرزبوونەوەی رێژەی وەبەرهێنانی بیانی ناراستەوخۆ لە ناو بۆرسەی ولاتدا.

4-ئاماژەکانی ئابووری بۆ پێشبینی کردنی قەیرانی دارایی:

دەتوانین ئاماژەکانی ئابووری بۆ پێشبینیکردنی قەیرانی ئابووری بۆ دوو کۆمەڵە دابەش بکەین:

ا-پەرەسەندنەکانی ئابووری هەمووەکی: The Evalution Of Macroeconomic

ئەمەش ئەم خاڵانەی خوارەوە لەخۆ دەگرێت:

-بەرزبوونەوەی تێکرای هەڵئاوسان.

-گەشەی خێرا بۆ لێشاوی نەختی.

-دابەزینی راستەقینە بۆ تێکرای گەشەی هەناردەکانەوە.

-بەردەوامی لە کورتهێنانی دارایی.

-بەرزبوونەوەی رێژەی قەرزی بێبەرهەم بۆ سەرجەمی قەرزەکانەوە.

-بەرز بوونەوەی رێژەی ژمێرکاری رەوەن وەك ریژەیەك لە سەرجەمی بەرهەمی نەتەوەیی.

-زیاد بوونی قەرزی دەرەکی.

-دابەزینی یەدەگی دراوە بیانییەکان.

-دابەزینی گەشەی ئابووری راستەقینە.

-بەرز بوونەوەی تێکرای نرخ و قازانج.

-بەرز بوونەوەی تێکرای سوودی ناوخۆ.

-بەرز بوونەوی تێکرای بێکاری.

ب-خەسڵەتە هەیکەلییەکان: Structural Characteristics

دەتوانین لەم خالانەی خوارەوە بیخەینە روو:

-دابەزینی تێکرای ئالوگۆری.

-ستراتیژییەتێکی زیاد لە پێویست بۆ هەناردەکان دەگیردرێتە بەر.

-بەرز بوونەوەی تێکرای گۆران لە قەرزی دەرەکی.

-بەرز بوونەوەی قەرزی دەرەکی ماوە کورت.

-ئازاد کردنی بازاڕی دارایی.
-لاوازی لە سەرپەرشتی کردن و ڕێکخستنی دارایی.
-بازاڕی سپاردە زامن دەکرێت بە هەبووە دارایی و عەقارییەکان.
-دابەزینی کڕین و فرۆشتنی پشکەکان.
-بازاری پشکەکان دەکەوێتە ژێر رکیفی ژمارەیەك دامەزراو.
-بوونی چاودێری لە سەر چوونە ژوور و هاتنە دەر لە بازاڕ.

## سێیەم

# گرنگترین قەیرانە داراییەکانی جیهان

هەر لەسەدەی شانزەهەمەوە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان ژمارەیەك قەیرانی دارایی و ئابووری ڕووبەڕووی جیهان بۆتەوە، لەوانە(قەیرانی بێبازاری گەورە ساڵانی (1929-1933)، شۆکی نەوتی یەکەم ساڵی 1973، شۆکی نەوتی دووەم 1979، شۆکی نەوتی پێچەوانەیی 1986، قەیرانی دارایی 1987، قەیرانی ژاپۆن1990، قەیرانی مەکسیك 1994-1995، قەیرانی دارایی وولاتانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا 1997، قەیرانی روسیا 1998، قەیرانی تورکیا1999، 2001، قەیرانی پشکی ئەلیکترۆنی 2000، قەیرانی دارایی ئەرجەنتین 2001، قەیرانی ڕەهنی عەقاری لە ئەمریکا 2007، لێرەدا ئاماژە بە چەند قەیرانێکی دارایی مەترسیدار دەکەین، کە ڕووبەڕووی جیهان بونەتەوە:

### 1-قەیرانی بێبازاری گەورە (1929-1933):

خراپترین کارەساتی ئابووری بوو، کە ڕووبەڕووی ئابووری جیهانی بۆوە، کە پێی دەگوترێت(قەیرانی بێبازاڕی گەورە)، کە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان بۆتە جێگای بایەخی توێژەرانی ئابووری. سەرەتای ئەو قەیرانەش لە ڕۆژی سێ شەممە (24. 10. 1929) دەستی پێکرد، ئەویش لە بۆرسەی نیویۆرك، دوای ئەوەی (13) ملیۆن پشك خرایە ڕوو، بەڵام کڕیار نەبوو، ئەمەش بووە هۆی بڵاوبوونەوەی پشێوی وپاڵنانی وەبەرهێنەکان بەرەو بۆرسە بۆ ئەوەی پشکەکانیان بفرۆشن، بۆ نیوەڕوی ئەو ڕۆژە ئاماژەی(مؤشر) داوجونز (22. 6%) بەهای خۆی لە دەستدا. هەر لەهەمان ڕۆژدا هەزارەها کەس لە خاوەن پشکەکان تووشی دەست بەتاڵی بوون بە تایبەتی لە چینی ناوەڕاست، تەنانەت (11) جامباز لە کۆتایی ئەو ڕۆژەدا خۆیان

لەسەر باڵەخانەی منهاتن خستە خوارەوە. بۆرسەی نیویۆرک هەرەسی هێنا ولە نێوان ماوەی (22. 10. 1929-13. 11. 1929)، سەرجەمی زەرەرمەندییەکەی گەیشتە(30) ملیار دولار، هەروەها ئاماژەی داوجونز (89%)ی بەهای خۆی لە دەستدا، تاوکو ساڵی 1931 کە ژمارەی ئەو کرێکارانەی بە بێ کار مانەوە لە ئەمریکا گەیشتە دوانزە ملیون کرێکار تا ساڵی 1932. ئەم برە پارەیەش بریتی بوو لە دە هێندەی بودجەی فیدرالی ئەمەریکی ئەو کاتە، برە پارەکەی زێدەتر بوو لە خەرجییەکانی جەنگی جیهانی یەکەم، تەنانەت کاریگەرییەکانی ئەو قەیرانە گەیشتبووە ئەو رادەیە، کاتێك یەکیك لە شاری نیوریوك بچوبایە میوانخانەیەك خاوەن میوانخانەکە پرسیاری ئەوەی لێدەکرد ئایا ئەو شوینی نووستنی دەوێ، یان دەیەوێت خۆی فرێبداتە خوارەوە(خۆی بکوژێت). ئەمە و کاریگەری ئەو قەیرانە بۆ زۆربەی وولاتانی ئەوروپا پەریەوە وبە خێرایی (تەنها یەکێتی سوڤێتی پێشوو نەبێ). بە هۆی بوونی پەیوەندیەکی هیکەلی بەتین لە نێوان ئەمریکا و ئەوروپا ئەویش لە رێگای بازرگانی نێو دەولەتی نێوانیان. ئەو قەیرانە وولاتە دواکەوتوەکانیشی بێ بەش نەکرد لە کاریگەری بێبازاری گەورە کە بوونە هۆی ئەوەی نرخ و بەهای کاڵای هاوردەی ئەو وولاتانە لە بازاری نێو دەولەتی بە هۆی نزم بوونەوەی خواستی جیهانی لەسەر ئەو کاڵایانە رووبەرووی فەوتان و لە ناوچوون بینەوە.بۆ زیاتر روون کرنەوە سەیری خشتەی ژمارە (1) بکە.

## خشتەی (1)

رێژەی داروخانی دەستهاتی وڵاتانی جیهانی سێ یەم لە قەیرانی بێبازاری گەورە

| رێژەی داروخانی دەستهاتەکان | وڵاتان |
|---|---|
| زیاتر لە 80٪ | شیلی |
| لە 75- 80٪ | چین |
| لە 70-75٪ | بولڤیا، کوبا، مەلایز، پیرۆ، سلفادۆر |
| لە 65-70٪ | ئەرجەنتین، کەنەدا، سیلان، هۆلەندا، ئیندێز، ئیستونیا، گواتیمالا هندستان، لاتیفیا، مەکسیک، سیام، ئیسپانیا |
| لە 60-65٪ | بەرازیل، دۆمەنیك، میسر، یۆنان، هایتی، مەجەر، نیکاراگوا، نیجیریا، پۆلەندا، یوغسلافیا |
| لە 55-60٪ | دانیمارك، اکوادۆر، هندۆراس، نیوزلەندا |
| لە 50-55٪ | ئوسترالیا، بولغاریا، کۆلومبیا، کوستاریکا، فلەندا، پەنەما، بارگوای |
| لە 45-50٪ | نەرویج، ئیران، پورتوگال، رۆمانیا |
| لە 30-45٪ | لیتوانیا، فلیپین، تورکیا، فەنزویلا |

سەبارەت بە کاریگەرییەکانی ئەو قەیرانە ئەوا دەتوانین لەم خاڵانەی خوارەوەی کورتی بکەینەوە:

ا-هەرەس هێنانی هەزارها کۆمپانیای دارایی .

ب-گواستنەوەی قەیرانەکە بۆ کەرتی ئابووری راستەقینە، واتە بۆ کەرتەکانی کشتوکاڵ وپیشەسازی،....هتد.

ج-زیادبوونی بێکاری بەجۆرێك ژمارەی بێکارەکان دەیەها ملیۆن کەس دەبوو.

د-بووە هۆی لاوازی هێزی کرینی بەکاربەران.

ه-بێبازاری بۆ کاڵای خراوە ڕوو.

و-راوەستانی بەرهەمهێنان لە کەرتی ئابووری راستەقینەدا.

### 2-قەیرانی دارایی 1987 :

یەکێکە لەو قەیرانانەی کە رووبەرووی سیستەمی سەرمایەداری بۆتەوە، بەهەمان شێوە ئەم قەیرانەش لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا رووی داوە. کاتی روودانیشی بۆ رۆژی دووشەممە رێکەوتی (19. 10. 1987) دەگەرێتەوە، بۆیە پێی دەگوترێت رۆژی دووشەممەی ڕەش. کە بووە هۆی هەرەسهێنانی نرخی پشکەکان لە بۆرسەی وول ستریت لە نیویورك، لە ئەنجامدا بە بڕی (500) ملیار دولار زەرەمەند بوو. هەروەها کاریگەری ئەو قەیرانە گواسترایەوە بۆ بۆرسەکانی لەندەن وتۆکیۆ. بەڵام ئەم قەیرانە کاریگەری لە قەیرانی بێبازاری گەورە کەمتر بوو، کە تەنیا بۆ ماوەی ساڵێك بەردەوام بوو، بەجۆرێك بۆرسەی وول ستریت هەرەسی تەواوی هینا، لە هەمان کاتدا ئاماژەی نیکای بەرێژەی دوو لەسەر سێ دابەزی. لە گرنگترین ئاسەوارەکانی ئەم قەیرانەش بریتییە لەم خاڵانەی خوارەوە:

ا-دابەزینی نرخی پشکەکان، وهەرەسهێنانی ئاماژەکانی داوجونز، ونیکای و فاینشال تایمز.

ب-کۆمپانیاکان هەڵسان بە دەرکردنی قەواڵەکان بۆ پارەدارکردن، لەگەڵ بوونی پوکانەوەی بەر چاو لە وەبەرهێنان و بەرهەم هێناندا.

ج-بەنکەکان رووبەرووی ئیفلاس بوونەوە لە ئەنجامی نەتوانینی قەرز کەرەکانەوە بە دانەوەی قەرزەکانیانەوە لە ماوەی دیاری کراودا.

د-زیادبوونی بێکاری، بەتایبەتی لە ریزی ئەو کەسانەی کە لە بەنك ودامەزراوە داراییەکان کاریان دەکرد.

هـ-کاریگەری لە سەر زۆربەی وولاتانی جیهان هەبوو، بەتایبەتی لە سەر وولاتە نەوتییەکانەوە، ئەویش بەهۆی دابەزینی بەهای دولارەوە.

### 3-قەیرانی دارایی مەکسیك ( 1994-1995 ):

مەکسیك تا کۆتایی ساڵی 1994، ببووە وولاتێك چەندان وەبەرهێنی بیانی روویان تێکردبوو، ئەمەش لە بەر ئەوەی دراوەکەی(بیزۆ)بەسترابۆوە بە دولارەوە، نرخی سوودی بەرزی پێشکەش دەکرد، بۆیە ملیارها دولار رووی لەو وولاتە کرد، بەمەش نیشانەی ئەوە دەستی پێکرد، کە مەکسیك بتوانێت بگاتە ئاستی وولاتانی باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا و وەك ئەوان بتوانێت قەرزەکانی بداتەوە. ئەوەش زۆری نەخایەند تا لە کۆتایی ساڵی 1994 قەیرانی دارایی ئەو وولاتە دەستی پێکرد.

لێرەدا دەبێ ئاماژە بەوە بکەین، کە گرنگترین ئەو هۆکارانەی بوونە هۆی ئەوەی لێشاوی سەرمایە لەو وولاتە زیاد ببێت بۆ ئەم خالانەی خوارەوە دەگەرێتەوە:

ا-نزمی نرخی سوود لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کە ئەو کات پەیوەندی بازرگانی ڕاستەوخۆی لەگەڵ مەکسیك هەبوو.

ب-ئەنجامدانی ریکەوتنامەی نافتا لەگەڵ وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و کەنەدا.

ج-زیادبوونی تێکرای گەشەی ئابووری مەکسیك بە ڕێژەی (3. 1%) لە نیوان ساڵانی (1988-1994).

د-بەرفردوان بوونی چوارچێوەی بەتایبەتیکردن لە ئابووری مەکسیکی دا.

سەبارەت بە دەرئەنجامی ئەم قەیرانە ئەوا دەتوانین لەم خالانەی خوارەوە کورتی بکەینەوە:

ا-لە دەستدانی(4.2) ملیۆن هەلی کارکردن لە ماوەی شەش مانگدا.

ب-ئیفلاسبوونی (60) هەزار کۆمپانیای بیناسازی.

ج-کەمبوونەوەی سەرجەمی بەرهەمی نەتەوەی بە ڕێژەی(10٪).

د-بەرزبوونەوەی تێکرای هەڵئاوسان بە ڕێژەی(35٪).

هـ-نزم بوونەوەی چاودێری لە سەر دراوی بیانی.

و-زیاد بوونی ڕێژەی بێکاری لە (3.7٪) لە ساڵی 1994 بۆ (6.5٪) لە ساڵی 1995.

**4-قەیرانی دارایی ( باشوری رۆژهەلاتی ئاسیا ) لە ساڵی1997 :**

وڵاتانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا ڕووبەرووی قەیرانێکی توند بوونەوە، ئەو قەیرانەش بە هەرەسهێنانی بەهای دراوی تایلاند دەستی پێکرد، ئەویش دوای بڕیاری حکومەتی تایلاند، کە بڕیاریدا بە ئازاد کردنی دراوەکەی، بەڵام حکومەت نەیتوانی پاڵپشتی دراوەکەی بکات، ئەویش بەهۆی ئەو جامبازییەیی کە ڕووبەڕووی دراوەکەی بویەوە، ئینجا دواتر قەیرانەکە تەشەنەی کرد بۆ وڵاتانی دیکە (ئەندونیسیا، فلیپین، مالیزیا، کۆریای باشوور،... هتد).

هەروەها بۆ یەکەم جار لە ماوەی 30 ساڵدا، ئاماژەی بۆرسەی هونگ کۆنگ (1211) خاڵ دابەزی. لە گرنگترین هۆکارەکانی ئەو قەیرانەش بریتی بوو لە:

1- دابەزینی بەرچاو لە بەهای دراوی وڵاتانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا.

2-بەرزبوونەوەی ڕێژەی هەڵئاوسان لە ماوەیەکی کەم لەو وولاتانە.

3-لاوازی چاودێری حکومەت، و نەبوونی شەفافیەت، کە بریتی بوو لە نا ڕاستی زۆربەی داتاکانی تایبەت بە چالاکی کۆمپانیاکان.

4-کشانەوەی لە ناکاوی سەرمایەیی بیانی بەرەو دەرەوە، هەر وەکو گەورە جامبازی ئەمەریکی(سیروس) ئەنجامی دا.

5-بەرزبوونەوەی قەرزی دەرەکی ئەو وولاتانەبۆ نموونە لە سالی 1996 قەرزەکانی کۆریای باشوور گەیشتە(100) ملیار دۆلار،وقەرزی ئەندەنووسیا(83)ملیار دۆلار،و قەرزی تایلاند(50)ملیار دۆلار،و قەرزی فلیپپینیش گەیشتە(35) ملیار دۆلاری ئەمەریکی.

6-لاوازی دام ودەزگا بەنکی و داراییەکانی ئەو وولاتانەبۆ نموونە حکومەتی تایلاند لەکۆی (60) دامەزراوی دارایی کە لە بۆرسەی بانکۆك کاریان دەکرد،(58) ی راگرت.

هەروەها لە گرنگترین ئاسەوارەکانی ئەو قەیرانە لەسەر وولاتانی باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا خۆی لەم خالانەی خوارەوە دەبینێتەوە:

1-بەرز بوونەوەی نرخی پێداویستییە سەرەکییەکان.

2-زیاد بوونی رێژەی بێکاری و کەم بوونەوەی کرێ ی کرێکار.

3-هەرەسهێنانی گەورەترین کۆمپانیا لە کۆریای باشور ئەویش کۆمپانیای ئاسن وپۆلای (هانبو) بوو، بەهەمان شێوە کۆمپانیای کیای بۆ بەرهەم هێنانی ئۆتۆمۆبیل رووبەرووی ئیفلاسبوون بوویەوە.

4-داخستنی بەنکەکان لە لایەن ئەو وولاتانە.

5- رێژەی هەژاری لە ناو ئەو وولاتانە لە (30%) بۆ (50%) بەرز بوویەوە.

بۆ زانینی شوێنی جوگرافی ئەو قەیرانە دارایی ونەختیانەی کە لە وڵاتانی جیهان لە نێوان ساڵانی (1987-2007) روویان داوە سەیری نەخشەی (1) بکە.

نەخشەی(1)

گرنگترین ئەو قەیرانە دارایی ونەختییانەی لەجیهان روویان داوە لەنێوان ساڵانی (1987-2007)



هەروەها بۆ شارەزابوون لەکۆی ئەو قەیرانانەی کە لە ساڵی1637 وە تا ساڵی 2008 رووبەرووی سیستەمی دارایی جیهانی بۆتەوە سەیری خشتەی(2) بکە.

خشتەی(2)

خستنەرووی قەیرانەکان لەنێوان ساڵانی(1637-2008)

| قەیرانەکان | ئامرازی قەیرانەکان | دەرئەنجامی قەیرانەکان |
|---|---|---|
| قەیرانی 1637 | قەولەکان | لە ساڵی 1637، دوای چەند ساڵێك لە جامبازی لە ئەوروپا، لە ناکاو نرخەکان دابەزی ئەمەش بووە هۆی ئیفلاسبوونی جامبازەکان، بۆیە مێژوو نووسەکان بە یەکەم قەیرانی دارایی دادەنێن، کە بەهۆی جامبازی یەوە رووی داوە. |
| هەرەسهێنانی 1720 | پشکەکان | دوو قەیرانی لە دوای یەك بوو کە نێوانەکەیان چەند مانگێك بوو لە فەرەنسا و ئینگلترا رووی دا، ئەویش تایبەت بوو بە پشکی کۆمپانیاکان کە سامانی جیهانی نوێیان دەست بە سەر داگرتبوو. |
| قەیرانی نەختی 1797 | بەنکەکان | بەنکی ئینگلترا رووبەرووی کەمی یەدەگی دەبێتەوە، ئەمەش وا دەکات بڕیاری راگرتنی پارە بدات، ئەمەش پشێوی لەنێو هاوڵاتیان وکۆمپانیاکان نایەوە، بۆیە دەستیان بەکێشانەوەی پاشەکەوت وقازانجەکانیان لە بەنکەکاندا کرد، کە بووە هۆی ئیفلاسبوونی بە کۆمەڵ، ئەمەش یەکەم قەیرانە لە ئاکامی پشێوی بە کۆمەڵ روو دەدات. |
| قەیرانی 1810 | بەنکەکان | دوای گەمارۆ دانی ئینگلترا لە لایەن ناپلیۆنەوە، بەمەش سیستەمی سپاردە هەرەسی هێنا، ئەویش |

| قەیرانەکان | ئامرازی قەیرانەکان | دەرئەنجامی قەیرانەکان |
| --- | --- | --- |
| | | لە بەر ئەوەی نەیدەتوانی مافەکانی لە کۆمپانیاکانی خۆی لە ئەمەریکای باشوور بە دەست بهێنێت، هەر ئەمەش قەیرانی پارەی بن دەست و بێکاری لێ کەوتەوە. |
| قەیرانی 1819 | بەنکەکان | بریتییە لە یەکەم قەیرانی دارایی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، ئەویش بە هۆی خەرجییەکانی جەنگی 1812 هاتە ئاراوە، ئەمە لە لایەك، لە لایەکی تر بەهۆی سیاسەتی لێگرتنەوە لە لایەن بەنکی ناوەندی ئەمەریکییەوە بوو. |
| قەیرانی 1825 | پشکەکان | دوای ئەنجامدانی جامبازیکی توند لە سەر وەبەرهێنانەکانی لە ئەمەریکای لاتینی(بەنکەکان، دڵنیایی، چەکدار کردنی کەشتییەکان...هتد)، بەهای پشکەکانی دابەزینی گەورەی بەخۆیەوە دیت لە بۆرسەی لەندەن، ئەمەش بووە هۆی ئیفلاسبوونی چەندان بەنك وزیاتر لە(3300)دامەزراو، سەرەڕای ئەوەی ئەو قەیرانە لە بەریتانیا روویدا، بەڵام بە یەکەم قەیران دادەنرێت، کە بۆرسەی گردبێتەوە. |
| هەرەسهێنانی 1836 | پشکەکان و بەنکەکان | ئینگلترا هەرەسهێنانیکی دیکەی بۆرسەی بەخۆیەوە دیت، دوای بریاری سەرۆکی ئەمەریکا ئەندرۆ جاکسۆن، کە مەرجی فرۆشتنی زەوی لە بەرامبەر کانزا بەنرخەکان دانا، ئەمەش گورزیکی پشت شکێن بوو بۆ جامبازی لە بازاڕ عەقاراتەکان لە ئەمەریکا، ئینجا بەهۆی ئەوەی |

| دەرئەنجامی قەیرانەکان | ئامرازی قەیرانەکان | قەیرانەکان |
| --- | --- | --- |
| بەنکەکانی ئەمەریکا،قەرزیان لە بەریتانیا دەکرد،بۆیە بەریتانیاش بەشیک لەو قەیرانەی بەرکەوت. | | |
| لەو ساڵەدا هەردوو بۆرسەی ڤینا ونەمسا،بەهۆی جامبازیکردنی زەبەلاحەوە لە لایەك، ونەبوونی رووپۆشی بۆ ئابووری راستەقینە لە لایەکی دیکە بووە هۆی هەرەسهێنانی راستەقینە،دوای ئەمە وڵاتانی ئەڵمانیا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاشی گرتەوە. | پشکەکان | هەرەسهێنانی 1873 |
| بە هێزترین قەیرانی ئابووری جیهانی یە لە سەدەی رابردوو دا. | پشکەکان | هەرەسهێنانی 1929 |
| ئیفلاسبوونی بەنکی ئەڵمانی( هیرستات )،ئەویش بەهۆی جیاوازی کات لە نێوان ئەڵمانیا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە روویدا. | بەنکەکان | قەیرانی 1974 |
| پارێزگاری بەنك هەڵسا بە بەرز کردنەوەی نرخی سوود پلە بە پلە وهەموو رۆژێك بە پێی پێویست،لە پێناو کەم کردنەوەی رێژەی هەڵئاوسان،ئەم سیاسەتەش لە کاتی خۆیدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا. | بەنکی فیدرالی ئەمەریکی | 1979 |
| دوای رووداوەکانی1973 لە کەرتی سوتەمەنی،بووە هۆی کەڵەکەبوونی قەرزی دەرەکی لە سەر وڵاتانی جیهانی سێیەم،سەرباری ئەمانە ئەو قەرزانە لە وەبەرهێنانەکان بە کار نەهێنرا،بەڵکو بۆ | بەنکەکان و نرخی سوود | قەیرانی 1982 قەرزەکان |

| قەیرانەکان | ئامرازی قەیرانەکان | دەرئەنجامی قەیرانەکان |
| --- | --- | --- |
| | | کورتهێنانی تەرازووی پێدان بەکارهێنرا،ئینجا قەیرانی نەوتی دووەم روویدا،ئەمەش دیسانەوە ئەو وڵاتانەی ناچارکرد پەنا بۆ قەرز وەرگرتنی کورتخایەن ببەن،ئەمەش باری زیاتر قورس کردن،قەیرانی مەکسیکیش یەکەم حالەتی نە توانینی دانەوەی قەرزەکان بوو،ئەمەش پشێوی جیهانی لێ کەوتەوە. |
| 1985 | بەنکی نیویورك | سیستەمی کارپێکردنی بەنکی نیویورك بۆ ماوەی 28 کاتژمێر وەستا،ئەمەش بووە هۆی وەستانی تەواوی کردەی راکێشان و پێدانی قەرزە حکومییەکان،بەمەش وایکرد بەنکی ناوەندی بە پەلە دەست تێبخات و (20)ملیار دولاری پێبدات. |
| هەرەسهێنانی 1987 | بازاڕی قەواڵە حکومییەکان،و دوای ئەوە بازاڕی پشکەکان | بەهۆی دابەزینی بەهای دۆلاری ئەمەریکی،بووە هۆی بەرز بوونەوەی نرخی سوود لە ماوەی درێژخاین دا،لەگەڵ ئەوەش بازارەکانی پشك گەشەیان کرد،بەڵام کاتێك نرخی سوود گەیشتە (400)خاڵ ،گەورەترین هەرەسهێنان لەمێژوو لە ماوەی رۆژێك تۆمار کرا،لە بۆرسەی پشکەکاندا،ئەمەش بە دەستێخستنی بەنکی ناوەندی ئەمەریکی کۆتایی پێ هات. |
| 1990 | سوتەمەنیەکان | لەگەڵ جەنگی کوێت سەری هەڵدا. |
| 1992 | سیستەمی ئەختی ئەوروپا | 20ی سبتمبەری 1992. |
| قەیرانی ئابووری مەکسیك1994 | نرخی سوود | لکاندنی بیزۆی مەکسیکی بە دۆلاری ئەمەریکییەوە ،ئەمەش زامنێکی وەهمی دروست کرد،هەر ئەمەش هانیدا قەرزی زیاتری بیانی |

| قەیرانەکان | ئامرازی قەیرانەکان | دەرئەنجامی قەیرانەکان |
| --- | --- | --- |
| | | وەربگرێت، بەمەش کورتهێنانی لە تەرازووی پێدان دروست کرد، بەڵام ئەمەریکا دەستی تێخست بەمەبەستی چارەسەرکردنی ئەو قەیرانە. |
| قەیرانی ئابووری ئاسیا1997 | بەنکەکان | ئەوەی لە مەکسیك روویدا لە تایلندیش دووبارە بۆوە، وئەو قەیرانە گواسترایەوە بۆ وڵاتانی دیکەی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا. |
| قەیرانی 1998 | نرخی سوود | بە درێژترین قەیرانی ئابووری لە مێژووی رووسیا و وڵاتانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو دادەنرێت. ئەمەش هەرەشەی لە سەر سیستەمی دارایی جیهانی دروست کرد. |
| 2000 | ئینتەرنێت، وپشکەکان | دامەزراوە داراییەکان روویان لە فرۆشتن لە رێگای ئینتەرنێتەوە کرد، ئەویش بەهۆی قەیرانی ئازاری سالی (2000) |
| 2001 | مەترسی لە سەر سیستەم | لە ئاکامی رووداوەکانی 11ی سیبتمبەری 2001 بووە هۆی لەناوچوونی ژمارەیەك بازاری کاغەزە داراییەکان، سەرباری زیان گەیاندن بە تۆڕەکانی گەیاندن، لێرەدا بەنکی ناوەندی ئەمەریکی دەستی تێخست لە رێگەی دابینکردنی پارەی بن دەست و بۆ ماوەی یەك هەفتە ،ئەویش لە بەر دروست بوونی مەترسی لە سەر سیستەمی داراییدا. هەروەها بەنکی ناوەندی ئەوروپا زیاتر لە 130 ملیار یۆرۆی پێشکەش بە بەنکەکانی ئەوروپا کرد، لە ترسی هەرەسهێنان. |
| قەیرانی2008 | مەترسییەکانی لە سەر سیستەمی سەرمایەداری | لە میانەی ئەم ئامیلکەیەدا باسی ئەم قەیرانە دەکەین |

## چوارەم

## سەرەتای سەرهەڵدانی قەیرانی دارایی 2008

دەتوانین سەرهەڵدان وپەرەسەندنی ئەو قەیرانە لەم خاڵانەی خوارەوە کورت بکەینەوە:

1-لە 11 ئەیلولی 2001 تا 11 ئەیلولی 2002 وە زیاتر لە (60) هەزار کۆمپانیا تووشی ئیفلاسی دارایی هاتن، هەروەها زیاتر لە 140 هەزار کریکار لە کارەکانیان دەرکران و بە بێ کار مانەوە.

2-لە ساڵی 2001 کۆمپانیای(یو، ئیس، ئەیرویز)ئیفلاس بوونی خۆی راگەیاند، کە ئەو کات چواردەمین گەورە کۆمپانیای جیهان هەژمارد دەکرا.

3-لەکانوونی دووەمی 2002 کۆمپانیایەکی زەبەلاحی ئەمەریکی تایبەت بە ووزە بە ناوی(ئینیرون) ئیفلاس بوونی خۆی راگەیاند.

4-هەر لە ساڵی 2002 دا کۆمپانیایەکی فرۆکەوانی دیکە بەناوی(مید، وای، ئیرلاینز)وازی لە کارکردن هێنا، کە بە سێیەم گەورەترین کۆمپانیای فرۆکەوانی لەجیهان دادەنرا..

5-لە ساڵی2005 دا سەرجەمی قەرزی نیشتمانی ئەمەریکی گەیشتە هەشت ترلیون وسەد وهەشتا ملیار دولار. هەروەها دوو ملیون دەوڵەمەندی ئەمەریکی لەو سالەدا ئیفلاس بوونی خۆیان راگەیاند.

6-لە ساڵی 2007 دا:

أ- نەتوانرا سلفەکانی رەهنی عەقاری بدرێت، بەمەش ئیفلاس بوونی بەنکەکان دەستی پێکرد.

ب- پشێوی لەبۆرسەکان دەستی پێکرد، بەنکی ناوەندیش دەستی تێخست تا پارەی ژێر دەست دابین بکات.

ج- ژمارەیەك لە بەنکەکان نزمی نرخی پشکەکانیان ڕاگەیاند، ئەویش بەهۆی قەیرانی ڕەهنی عەقارییەوە.

7-لە ساڵی 2008 دا:

ا-وەزارەتی خەزێنەی ئەمەریکا، هەر دوو گروپی(فریدی ماك) و (فانی مای) لە بواری قەرزی عەقاری خستە ژێر چاودێری خۆیەوەو لەگەڵ خستنە ئەستۆی قەرزەکانی تا سنووری (200) ملیار دولار.

ب-بەنکی لیمان برازەر ئیفلاس بوونی خۆی ڕاگەیاند.

ج-حکومەتی ئەمەریکا هەڵسا بە خۆماڵی کردنی گەورەترین گروپی دڵنیایی لە سەرانسەری جیهانی (AIG)، کە مەترسی ئیفلاسبوونی لێدەکرا، بۆیە یارمەتیەکی بەبڕی (85) ملیار دولار پێشکەش کرد، لە بەرامبەر خاوەنداریەتی (9. 79٪) پشکی ئەو گروپە.

د-بۆرسە جیهانییەکان لە هەرەسهێنانێکی بەردەوام دابوو.

## پێنجەم

## هۆیەکانی قەیرانی دارایی 2008

لیرەدا هەوڵی ئەوە دەدەین گرنگترین هۆکارەکان بخەینە روو کە بۆتە هۆی سەرهەڵدانی ئەو قەیرانە:

1-رەگ وریشەی ئەو قەیرانە داراییە بۆ زیادبوونی پێشکەش کردنی قەرزی عەقاری دەگەڕێتەوە، لەگەڵ بوونی رەهنی عەقاری، لە لایەن دامەزراوە داراییەکانی ئەمەریکاوە، بە سوودیکی گۆڕاوەوە، (واتە نرخی سوود زیاد دەبێت کاتیك ئەو نرخە لە لایەن بەنکی فیدرالی ئەمەریکی بەرز کرایەوە)، بەبێ بوونی هیچ زامنێك. جێگای ئاماژە پێکردنە لەو کاتەدا ڕێژەی سوود نزم بوو، ئەمەش وایکرد ئەم جۆرە قەرزە پەرەبسەنێت وزیاد ببێت، ئەو قەرزانەش بۆ مەبەستی یەکەی نیشتەجێ بوون وەبەرهێنانی ماوەدرێژ وجامبازی رەهنکاری بوون. ئینجا بەنکەکان هەڵسان بەگۆڕینی ئەو قەرزە پێشکەش کراوانە بۆ قەواڵەکان لە بۆرسەکاندا، لیرەدا وەبەرهێنەکان هەڵسان بە کرینی ئەو قەوالانە لەبەنکەکاندا، ودووبارە لە لای بەنکی دیکە ئەو قەوالانەیان بە رەهن دادەنا بۆئەوەی قەرزی زیاتر بە دەست بهێنن، بۆ ئەوەی قەوالەی زیاتر بکڕن، ئەو کردەیەش بەردەوام بوو. (واتە بەکارهێنانی قەرز بۆ بە دەست هێنانی قەرزی زیاتر)، ئەمەش وای کرد کەلینیکی گەورە لەنێوان ئابووری راستەقینە وئابووری دارایی دروست ببێت.

ولە هەنگاوێکدا بۆ بەهێزکردنی قەواڵەکان، بەنکەکان هەڵسان پەنایان بۆ کۆمپانیا گەورەکانی دڵنیایی برد، بەمەبەستی خۆپاراستنی بەنك وخاوەن خانووەکان لە ئیفلاس بوون، ئەمەش دیسانەوە وایکرد زیاتر هەوڵی بە دەست هێنانی قەواڵەکان بدرێت. هەموو ئەمانەش وایانکرد لەساڵی 2007 وە بەهای عەقاراتەکانیان کەمتر بێت لە بەهای قەواڵە مامەڵە پێکراوەکان، لیرەدا خاوەن

عەقاراتەکان نەیانتوانی قەرزەکانیان بدەنەوە، هەتا دوای فرۆشتنی عەقاراتە رەهنکراوەکانیش، ئەمەش وایکرد بکەونە ژێر باری قەرزەوە. لەهەمان کاتدا بەنکەکان تووشی زیان بوون، بۆیە بەهای پشکەکانیان لە بۆرسەکاندا دابەزی، ئەمەش وایکرد ژمارەیەك لە کۆمپانیاکانی عەقاری ودڵنیایی ئیفلاس بکەن. ئەم کارەش ئەوەی خستە مێشکی وەبەرهێنەکان، کە باریکی بێ متمانەیی لەئارادایە، هەر ئەو بێ متمانەیەش وایکرد خەڵك پارەکانیان لە بەنکەکان بکێشنەوە، وبۆرسەکانیش تووشی ئیفلیجی و ئیفلاسی تەواو بن. تا وای لێهات وەبەرهێنەکان متمانەی تەواویان بە بۆرسەکانەوە نەما. بەجۆرێك کەرتی دارایی لە سیستەمی سەرمایەداری زۆر هەستەوەرە بە شێوەیەك کاریگەری یەکێك لە کیانە داراییەکان دەگوازرێتەوە بۆ هەموو کیانە داراییەکانی دیکە. بۆ زیاتر روون کردنەوە سەیری هێڵکاری (2)بکە.

هێڵکاری(2)

لە زێدەی داراییەوە بۆ قەیرانی پارەی ژێر دەستی جیهانییەوە



2- بەرزبوونەوەی نرخی سوود لە ئەمریکا.

3-ئەنجامدانی چالاکی جامبازی دوور لە هەموو بنەماکانی رەوشتی ئابووری.

4-گرنگی نەدان بە وووردەکاری داتاکان ونەبوونی شەفافیەت وچاودیری لەسەر بەنکەکاندا.

5-پشت بەستن بە تیوری بەجیهانیبوون، کە خۆی لەم خاڵانەی خوارەوە دەبینێتەوە:

ا-فرەوان کردنی ئازادی بازاڕ.

ب-ئازادی جوڵەی سەرمایە لە سەرانسەری جیهاندا.

ج-ئازادی بەرهەم هێنان وخستنەبازاڕ لە سەرانسەری جیهاندا.

د-فرەوانکردنی وەبەرهێنانی بیانی.

ه-هەڵوەشاندنەوەی پاراستنی بازرگانی و ئاستەنگە گومرگییەکان.

و-هەڵوەشاندنەوەی کەرتی گشتی، و فرۆشتنی بە کەرتی تایبەتی.

ز-دەست تێنەخستن لە سیاسەتی نرخ و کرێدا.

ح-نەهێشتنی پاڵپشتی حکومەت بۆ نرخەکان.

هەموو ئەمانەش رێگەیان خۆش کردووە، کە ئابووری زۆربەی وولاتانی جیهان بە بەردەوامی لە ژێر کاریگەرییەکانی سەرهەڵدانی قەیرانەکانەوە بن،بە ئاسانی توانای خۆ رزگار کردنیان نەبێت.

6-سیاستە دەرەکییە هەڵەکانی وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، بووە هۆی بەرزبوونەوەی قەبارەی خەرجییە سەربازییەکانی ئەو وولاتە، بە تایبەتی خەرجی یەکانی داگیر کردنی ئەفغانستان و عیراق ،کە خەرجیەکی سەربازی زەبەلاح هەژمارد دەکرێت لە مێژووی سەربازیدا، هەر ئەمەش بووە هۆی بەرزبوونەوەی

قەبارەی قەرزەکانی حکومەت، کە بە (11) ترلیون دولار مەزەندە دەکرێت، کە ئەمەش زیاتر لە(65٪)ی سەرجەمی بەرهەمی ناوخۆی ئەمەریکا پێك دەهێنێت.

7-زۆر لە بەریوەبەر وبەرپرسەکانی بەنکە گەورەکانی ئەمەریکا مووچەیەکی خەیاڵییان وەردەگرت، بۆ نموونە بەنکی لیمان برازەرز(کە لە میانەی ئەم قەیرانە هەرەسی هێنا) مووچەی ساڵانەی بەریوەبەرەکەی(400) ملیون دولار بوو.

8-بوونی مەسەلەی گەندەڵی لەنێو دامەزراوە ئابوورییەکانی ئەمەریکا، چونکە بوونی گەندەڵی لە ئابووری هەر وڵاتێك واتە ئەو وولاتە تووشی ئایدزی ئابووری بووە.

9-بوونی کەلێنی گەورە لەنێوان کەرتی دارایی وکەرتی راستەقینە، بۆ نموونە:قەبارەی مامەڵەکانی وول ستریت لە ساڵی 2006 گەیشتە (34) ترلیۆن دولار، کەچی قەبارەی سەرجەمی بەرهەمی ناوخۆی ئەمەریکا (13) ترلیۆن دولار بوو.

10-بوونی کورتهێنانی بەردەوام لە هاوسەنگی بازرگانی ئەمەریکی هەر لەساڵی 1971 وە، بۆ نموونە لەساڵی 2006 ئەو کورتهێنانە گەیشتە (758) ملیار دولار.

11-پرۆسەکانی تەوریق، واتە بەنکەکان هەڵساون بە گۆڕینی زامنی قەرزەکان بۆ کاغەزە داراییەکان، کە بەهۆیەوە قەرزی تازەی بە دەست هێناوە، ئەو قەرزە تازانەش بەنك ودامەزراوە داراییەکان دیسانەوە بەشێکییان دە گۆری بۆ کاغەزە داراییەکان، بۆ ئەوەی قەرزی تازە بە دەست بهێنن، بەم شێوەیە بەردەوام بوو، بنیاتنانی دارایی هەر یەکەیان پشتی بەوی تر دەبەست، واتە ئەگەر بەشێك لەو

بینایە داراییە هەرەسی هێنا، ئەوا بەشەکانی تر هەرەس دەهێنن، هەر وەکو رووی‌دا.بۆ زیاتر روون کردنەوە سەیری هێڵکاری(3)بکە.

12-زۆربەی مامەڵەکان پەیوەستبوون بە ئایندە، هەر وەکو وەبەرهێنیك هەڵدەستا بەفرۆشتنی کالایەك کە بوونی نەبوو، واتە لە ئایندە دروست دەبێت ئەمەش مانای ئەوەیە پێش ئەوەی کاڵایەك دابهێنرێت واتە بەرهەم بهێنرێت، وەبەرهێنەکان سەودایان پێ دەکرد، بە مەبەستی بە دەست هێنانی قازانجی زۆر. مامەڵەکانی ئایندە پشت بە متمانە دەبەستن، ئەمەش مانای بوونی مەترسی گەورە دەگەیەنێت.

13-بەردەوامی لە کورتهێنانی بودجەی ئەمەریکی تا ئەوە بوو لە ساڵی 2004 لە (6) ترلیۆن دولار رەتیدا.

14-نزمی ئاستی پاشەکەوتی تاکی ئەمەریکی، بەهۆی زیادبوونی ئارەزووی بەکاربردنی تاکی ئەمەریکی، هەروەها ریژەی پاشەکەوتی تاکی ئەمەریکی بریتی بوو لە(50%)ی پاشەکەوتی تاکی ژاپۆنی.

15-بوونی سندوقەکانی کرینی گرێبەستەکانی ئایندە(صناديق التحوط) Hedge Funds،کە هاوشێوەی گازینۆیە، و دامەزراوی دارایی هەلبژاردەن، کراوەش نی یە بۆ هەموو خەڵك، بەڵکو تەنیا بۆ دەوڵەمەندە گەورەکانە، هەر سندووقێکیش تەنیا (500) وەبەرهێن لە خۆ دەگرێت، هەر یەك لەو وەبەرهێنانەش رسومی بەشداری کردن بەلایەنی کەم یەك ملیۆن دۆلار دەدەن، وکرێ ی بەرێوەبەری سندووقەکەش بریتی یە لە (1-2%) لە بەهای هەبووەکان و (20%)ی قازانجەکان. لەوەش گرنگتر ئەو سندوقانە بە رەسمی تۆمار نەکراون، وناکەونە ژێر چاودێری یەوە.

## هێلكاری (3)

## پرۆسەی تەوریق (بەدەستهێنانی قەرز بە قەرز) روون دەكاتەوە

كۆمەڵێك قەرزی عەقاری ماوە درێژ كە بانكەكان خاوەنداریەتی دەكەن وبە بەهای عەقارەكان زامن كراوە. كە ئەو قەرزانە پارەداریان كردووە

ئەو قەرزانە دەستهاتی (٪١٠) بۆ بەنكەكان دەستەبەر دەكەن

ئەو بەنكانە (خاوەن قەرزەكان) لەسەر بنچینەی بەهاكەی + دەستهاتی قەواڵەكان یان بڕوانامەكان وەبەرهێنان و فرۆشتنی بۆ بەنكەكانی دیكە (وەبەرهێنەكان) بە بەهای بە ناو (القیمە الاسمیە)، لە بەرامبەر دا بەنكە خاوەن قەرزەكان پارەی بن دەست (السیولە) بە دەست دەهێنێت و لە بوارەكانی دیكە وەبەریان هێناوە و نرخی سوودی (٪٧)ی دەدیە وەبەرهێنان

بەهای قەواڵەكان

نرخی سوود (دەستهات)

ئەو قەواڵانە لە لایەن وەبەرهێنەكانەوە دەكردرێت، كە زۆربەیان بەنكی دیكە بوون، بەهای قەواڵەكانیان دایە ئەو بەنكانە و نرخی سوودیان بە رێژەی (٪٧) وەردەگرت



بە هۆی دەستکەوتە زۆرەکانی ئەو سندووقە، وای کردووە ئەو جۆرە سندووقە لە سەرانسەری جیهان بلاو ببێتەوە هەتا زۆر جار بەوە باسی دەکەن،کە خاوەنی گەردوونە،ئەویش لە بەر ئەوەی (2/3) ی مامەڵەکانی پشك لە سەرانسەری جیهان ئەو سندووقانە بەسەری دا زاڵن، وخاوەنداریەتی هەبووەکان بە بڕی (2) ترلیۆن دۆلار دەکەن. هەروەها لە ساڵی 2006 کرێی هەندێك لە بەرێوەبەرە سەرەکی یەکانی ئەو سندووقانە گەیشتە یەك ملیار دۆلار.

ئەمەو ئەو سندووقانە لە بەنکەکان بەنرخێکی سوودی نزم قەرز وەردەگرن، دوای ئەوە لە شوێنێکی تر بە نرخێکی بەرزتر وەبەری دەهێنن، وقازانجیش لە جیاوازی هەر دوو نرخ دەکەن، کە ناسراوە بە (الرفع المالي). بۆ نموونە ئەو سندووقانە قەرزیان لە بەنکەکانی ژاپۆن بە نرخێکی کەم وەرگرتووە و دوای ئەوەی وەبەریان هێناوە لە وولاتانی وەك بەرازیل و ترکیا، کە نرخی سوود لەو ولاتانە بەرزە

هەموو ئەو خالانەی سەرەوە بووە هۆی:

1-قەیرانی گەورە لە پارەی بن دەست(السیولة) لە بۆرسە جیهانییەکاندا.

2-دابەزینی خواست لە سەر کەرستەی خاو، ئەمەش بووە هۆی دابەزینی نرخەکەی.

3- ژمارەیەکی زۆر لە کۆمپانیا جیهانییە گەورەکان لە بوارە جیاجیاکان رووبەرووی ئیفلاسبوون بوونەوە.

## شەشەم

# بۆچی قەیرانی دارایی ئەمەریکی بووە قەیرانێکی جیهانی؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دەبێ ئاماژە بەم هۆکارانەی خوارەوە بکەین:

1-ئاشکرایە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا گەورەترین وڵاتی هاوردەیە لە جیهان، بەجۆریك کاڵای هاوردەی سالانەی دەگاتە (1919) ملیار دولار، کە دەکاتە ( 15.5٪)ی هاوردەی هەموو ولاتانی جیهان، بۆیە بوونی قەیرانی ئابووری لەو ولاتەدا کاردانەوەی نێگەتیڤی لە سەر هەناردەی ولاتانی جیهان دروست دەکات.

2-دیارە خاوەن سەرمایەکانی وەبەرهێنان لەسەرانسەری بۆرسەکانی جیهان وەبەرهێنان دەکەن، ئینجا ئەگەر هاتوو لە ولاتیك پشکەکانیان دابەزی، وزەرەرمەند بوون، ئەوا داراییەکانیان بۆ ولاتانی دیکە دەکێشنەوە، بەمەبەستی دوور کەوتنەوە لەو زیانە، یان بۆ قەرەبۆ کردنەوەی زیانەکانیان کە ئەمەش کاریگەری نێگەتیڤ دەکاتە سەر ئەو شوێنەی کە پشکەکانی بۆ گواستراوەتەوە.

3-دابەزین وبەرزبوونەوەی نرخی ئالوویری دولار، کاریگەری لە سەر ئاستی جیهانی دروست دەکات، لە کاتێکدا ئەگەر بزانین دولار، کە تا رۆژی ئەمرۆمان بە گەورەی دراوە جیهانییەکان دادەنرێت.

# حەوتەم

## ئاسەوارەکانی لە سەر وولاتانی جیهان:

ئاسەوارەکانی ئەو قەیرانە داراییە ترسناکە زۆر بەر فرەوانە بۆیە ئاماژە بە چەند لایەنێکی دەکەین ئەویش بەم شێوەی خوارەوە:

*** لایەنە نێگەتیڤەکان:**

-لە سەر ئاستی جیهانی:

1- مەزەندەی ئەوە دەکرێت، کە زیانی ئابووری جیهانی لە ئەنجامی ئەو قەیرانەدا نزیکەی(50)ترلیۆن دولار بێت.

2-ئەو قەیرانە داراییە کاریگەریەکەی گواسترایەوە بۆ زۆربەی بۆرسەکانی جیهان، هەروەها تەنیا کەرتێکی ئابووری نەگرتەوە، بەڵکو هەموو کەرتە ئابوورییەکانی گرتۆتەوە، ئەمەش کاریگەری نێگەتیڤانەی بۆ سەر گەشەی ئابووری جیهانی دروست کردووە، بەهۆی کەم بوونەوەی بەکاربردنی کاڵا و خزمەتگوزاری لە لایەن تاکی ئەمەریکی یەوە.

3-دابەزینی تێکرای گەشەی وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، کاریگەری نێگەتیڤی لە سەر هاوسەنگی بازرگانی زۆر لە وولاتانی جیهان دروست کردووە.

4-کەم بوونەوەی وەبەرهێنانی بیانی لە سەرانسەری جیهان، بەهۆی ئەوەی زۆربەی کۆمپانیا فرە رەگەزەکانی جیهان خاوەنداریەتییان بۆ ئەمەریکییەکان دەگەرێتەوە.

5-ژمارەی ملیاردیرەکانی جیهان رووی لەکەمی کردووە، و ئەو ملیاردیرانە نزیکەی دوو ترلیۆن دۆلاریان زەرەر کردووە، لە وانەی زەرەرمەندی گەورە بوینە بریتیین لە(بیل گیتس،کارلۆس سەلیم، وارین بافیت).

6-زۆر لە کۆمپانیاکانی پیشەسازی ئۆتۆمۆبیل ئیفلاسیان کردووە، یان ئیفلاسیەکەیان بۆ کاتێکی تر دواخستووە، لەوانە کۆمپانیاکانی(ژەنەراڵ موتورز، کراسیلر، بونتیاك، فورد)، بۆیە وەزارەتی خەزینەی ئەمەریکا پاڵپشتی ئەو کۆمپانیا زەبەلاحانەیان کردووە، هەر بۆ نموونە:کۆمپانیای(ژەنەراڵ موتورز)، لە ساڵی 2008 زیاتر لە (31) ملیار دۆلاری زەرەر کردووە. سەرباری ئەمانەش ئەو کۆمپانیایە لەنیوەی یەکەمی ئەمساڵ ئیفلاسبوونی خۆی راگەیاند.

7-بەرزبوونەوەی ریژەی بێکاری لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆ رێژەی زیاتر لە (6. 5%).

8-دابەزینێکی بەرچاو لە بەرهەمی پیشەسازی ئەمەریکا، بە شێوەیەك هاوشێوەی نەبووە لە ماوەی (34) ساڵی رابردوو.

9-تەنیا لە ساڵی 2009 دا تا ئێستا (120) بەنك لە ئەمەریکا هەرەسییان هێناوە.

10-چوونە دواوەی ئابووری بەریتانیا.

11-ئابووری ئەڵمانیا تووشی حالەتی کەساد بووە.

12-ناوچەی یۆرۆ تووشی پوکانەوەی ئابووری هاتووە.

13-بەرزبوونەوەی بێکاری لە فەرەنسا بەریژەی (7. 7%).

14-دابەزینی بۆرسەی ژاپۆن بە ریژەی (1. 4%).

15-بەرفرەوان بوونی کەلێن(الفجوە) لەنێوان دەوڵەمەند وهەژارەکان لە وولاتانی جیهاندا.

-لە سەر ئاستی وولاتانی جیهانی سێیەم:

1-مەزەندەی ئەوە دەکرێت، کە وولاتەکانی کەنداو لە ئەنجامی ئەو قەیرانەدا زیاتر لە(500)ملیار دۆلار زەرەر مەند بن.

2-مەزەندەی ئەوە دەکرێت، کە وولاتانی ئاسیا بیجگە لە ژاپۆن زیاتر لە (10) ترلیۆن دولار لە ئاکامی ئەو قەیرانە زەرەر مەند بین.

3-توند بوونی کردەی قەرز وەرگرتن لە بەنکە جیهانییە سەرەکییەکان، کە بەشێوەیەکی نێگەتیڤ کاری لە پلانی پەرەپێدانی وولاتانی جیهانی سێیەم کردووە.

4-ئەو برە پارانەی تەرخانکراوە. بۆ دەرباز کردنی دامەزراوە داراییەکان، کاریگەری نێگەتیڤی لە سەر وولاتانی جیهانی سێیەم دروست کرد، هەروەها بۆتە هۆی زیاد بوونی رادەی هەژاری لەو وولاتانەدا.

5-دابەزینی خواست لە سەر کەرستەی خاو بە تایبەتی نەوت[*]، ئەمەش بووە هۆی دابەزینی نرخی نەوت لە بازارە جیهانییەکاندا، هەر ئەمەش کاریگەری نێگەتیڤی لە سەر ئابووری وولاتە بەرهەم هێنەکانی نەوت دروست کرد بە جۆرێك هەندێك لەو وولاّتانە توانای دابین کردنی بوجەی ساڵانەیان دابەزی.

6-کەم بوونەوەی جوڵەی گەشت وگوزار لە سەر ئاستی جیهانی ئەمەش کاردانەوەی نێگەتیڤی لەسەر زۆر لە وولاتانی جیهانی سێیەم دروست کردووە، لە وانە: مەغریب ومیسر وترکیا... هتد کە دەرامەتی کەرتی گەشت و گوزار بەشی بەر چاو لە ئابووری ئەو وولاّتانە پێك دەهێنێت.

7-کەم بوونەوەی قەبارەی وەبەرهێنانی بیانی راستەوخۆ بۆ وولاتانی جیهانی سێیەم.

8-کەم بوونە وەی هەلی کاروو بیکاربوونی زۆر لەکرێکارانی جیهانی سێیەم کە لە وولاتانی پێشکەوتوو کاریان دەکرد، ئەمەش وایکردووە ئەو برە پارەیەیی ئەو کرێکارانە بۆ وولاتەکانیان رەوانەیان دەکردەوە روو لە کەمی بکات، بۆ نموونە:

---

(*) هەر چەندە لە کاتی ئێستادا نرخی بەرمیلێك نەوت بۆ سەرەوەی (75) دۆلار بەرز بۆتەوە، بەلاّم ئەم بەرز بوونەوەیەش لە بەرژەوەندی وولاّتانی جیهانی سێ یەم نی یە کە بەرهەم هێنی نەوت نینە.

لەساڵی 2008 بڕی (600) ملیۆن دولار لە پارەی کریکارە میسرییەکان کەمی کردووە بە بەراورد لە گەڵ ساڵانی رابردوو.

9-بۆتە هۆی سەرهەڵدانی (قەیرانی دوبەی دارایی)، دوای ئەوەی شەپۆلەکانی تسۆنامی قەیرانی دارایی جیهانی لێوارەکانی وولاتانی کەنداویشی گرتەوە ئەمەش دوای ئەوە هات، لەگەڵ داخستنی بازاڕ لە (2009/11/25) لە ئیمارەتی دوبەی، ئەو هەواڵە بلاو بوویەوە، کە کۆمپانیای دوبەی جیهانی، داوای دواخستنی قەرزەکانی کردووە، کە دەبوایە لە مانگی (کانونی یەکەمی) ساڵی 2009 بیداتەوە کە بڕەکەی (3.5) ملیار دۆلارە بۆ ماوەی شەش مانگ، ئەویش بە مەبەستی دووبارە هەیکەلکردنەوەی قەرزەکانی ئەو کۆمپانیایە کە دەگاتە (59) ملیار دۆلار.جێی ئاماژە بۆ کردنیشە هەندیك سەرچاوە باس لەوە دەکەن،کە کۆمپانیاکانی ئیمارەتی دوبەی نزیکەی(100)ملیار دۆلار قەرزار بن.

-لە سەر ئاستی عیراقدا:

لە بەر ئەوەی عێراق خاوەن بورسەیەکی پێشکەوتوو نەبوو، لە هەمان کاتدا بۆرسەکەی پەیوەندی ئەو تۆی بە بۆرسە جیهانیەکانەوە نەبوو، بۆیە ئەو قەیرانە کاریگەری ترسناکی لە سەر ئابووری عێراق دروست نەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەو قەیرانەدا بێبەش نەبووە کە دەتوانین ژمارەیەك ئاسەواری نێگەتیڤی بخەینە روو:

1-دابەزینی نرخی نەوت، کاریگەری نێگەتیڤی لە سەر بودجە عێراق بۆ ساڵی 2009 دروست کردووە وتووشی کورتهێنانی کردووە.

2- دابەزینی نرخی نەوت بۆتە هۆی بەر تەسك بوونەوەی پلانی ئاوەدان کردنەوە وبنیاتنانەوەی عێراق.

3-کاریگەری نێگەتیڤی لە سەر پێشخستن و زیاد کردنی بەرهەمهێنانی کەرتی نەوت لە عێراقدا دروست کردووە.

4-واچاوەروان دەکرێت لە ماوەی مام ناوەندا، لەعێراق ڕێژەی بێکاری ڕوو لە بەرز بوونەوەی زیاتر بکات.

5-دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی یەدەگە نێودەوڵەتییەکانی عێراق لە دراوە بیانییەکاندا. کە ئێستا دەگاتە زیاتر لە (21) ملیار دولار.

-لە سەر ئاستی هەرێمی کوردستاندا:

1-بۆتە هۆی کەم بوونەوەیەکی بەرچاو لەپارەدارکردنی ئەو ڕیکخراوە بیانییانەی لە هەرێمی کوردستان چالاکی ئەنجام دەدەن وەك: چالاکی هەڵگرتنەوەی مین، ئەمەش کاریگەری نێگەتیڤی لە سەر ناوچە گوندنشینەکانەوە دروست کردووە.

2-بەهەمان شێوە دابەزینی نرخی نەوت کاریگەری نێگەتیڤی لە سەر بودجەی هەرێمی کوردستان دروست کردووە، کە دەکاتە (17٪)ی بودجەی عێراق. ئەمەش کاریگەرێکی خراپ لە سەر ئاوەدانکردنەوەی کوردستان بۆ ئیستا و ئاینده دروست دەکات.

3-کەم بوونەوەی چالاکی کۆمپانیا بیانییەکان لە هەرێمی کوردستاندا کە بۆتە هۆی ئەوەی هەندێ لە کۆمپانیایەکان بە شێوەیەکی کاتی یان هەمیشەیی کارەکانیان ڕابگرن.

***لایەنە پۆزەتیڤەکان:**

ئاشکرایە هەموو دیاردە وقەیرانێکی ئابووری لایەنی نێگەتیڤ و پۆزەتیڤی هەیە ،کەواتە قەیرانی دارایی جیهانیش هەردوو لایەنی لیَ دەخوێنرێتەوە،دیارە لە بڕگەی پێشوو باسی لایەنە نێگەتیڤەکانمان کرد،بۆیە ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە

باس لە هەندیك لایەنی پۆزەتیڤ بکەین،بەتایبەتی لە سەر وولاتانی جیهانی سێیەم:

1-دابەزینی نرخی کالاکانی بەکاربردن و سووتەمەنی، واتە دابەزینی ڕێژەی هەلئاوسان.

2-دابەزینی نرخی کەرستەکانی خانووبەرە،کە ئەمەش دەبێتە هۆی دابەزینی نرخی یەکەکانی نیشتەجێبوون،ئەمەش بۆ بەرژەوەندی بەکاربەرە.

3-دابەزینی کرێی گواستنەوە،بە تایبەتی گواستنەوەی ئاسمانی.

4-گەڕانەوەی دارایيە وەبەرهێنەکان لە وولاتە رۆژئاواییەکانەوە بۆ وولاتانی جیهانی سێیەم،بەتایبەتی دارایی زێدە نەوتییەکانی وولاتانی کەنداو.

5-هانی ئەو وولاتانە دەدات،کە سەرچاوەکانی داهاتی خۆیان هەمەجۆر بکەن.

6-هەیمەنەی تاك جەمسەری وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە پەیوەندییە نێودەولەتییەکان لاواز دەکات.

7-چاوخشاندنەوە بە یاسا و ریساکانەوە،کە چالاکی دامەزراوە جیهانییەکانی سندوقی نەختی نێودەولەتی و بەنکی نێودەولەتی و ریکخراوی بازرگانی جیهانی رێکدەخات.

8-سیستەمی دارایی و نەختی جیهانی لە ئاییندە دەبەسترێتەوە بە چاودێری و شەفافیەتەوە.

9-دەبێتە هۆی گۆرینی نەخشەی وەبەرهێنانی بیانی لە سەرانسەری جیهان.

10-دوای سەرهەلدانی ئەو قەیرانە، ئێستا ئاراستەکان بەرەو وەبەرهێنان لە کەرتەکانی بەرهەمداری راستەقینە دەروات،لە هەمان کاتدا وەبەرهێنانی ڕەمزیش لە جیهان سنووردار بووە.

**بۆ روون کردنەوەی زیاتر لە بارەی قەیرانی دارایی جیهانی 2008 و کاریگەری لەسەر عیراق و هەرێمی کوردستان(کە بەشێکن لە جیهانی سێیەم) سەیری هێڵکاری (4) بکە.**

**هێڵکاری(4)**

**بەشێك لە کاریگەرییەکانی قەیرانی دارایی جیهانی لە سەر عێراق وهەرێمی کوردستان**



# هەشتەم

## هەنگاوەكانی خۆ دەرباز كردن لەو قەیرانەدا:

لە زۆربەی وولاتانی جیهان حكومەت و بەنكە ناوەندییەكان دەستیان لە ئابووری خست، بە ئامانجی كەم كردنەوەی كاریگەرییە نێگەتیڤەكانی ئەو قەیرانە، ئەویش لە میانەی ژمارەیك لێكۆلینەوە لە وانە:

1-پیادەكردنی پلان بۆ دەرباز كردنی گەورە بەنك ودامەزراوە داراییەكان لەو تەنگژەیەی تێی كەوتوون، دەسەڵاتدارانی ئەمەریكا لە ساڵی 2008 بریاری پلانێكییان بە بری (700) ملیار دولار دەست پێكرد، بە ئامانجی كرینی ئەو هەبووانەی تووشی تەنگژەببوون. هەروەها بەریتانیا و ئەڵمانیا و فەرەنساش پلانێكی هاوشێوەییان بەبری (497) و (644) و (454) ملیار دولار پیادەكرد.

2-دابەزاندنی نرخی سوود: بۆ ئەمەش ژمارەیەك بەنكی ناوەندی لەجیهان پەیرەوییان كرد، لەوانە ئەنجومەنی یەدەگی فیدرالی ئەمەریكی نرخی سوودی لە (2%)بۆ(1%) دابەزاند، وبەنكی ناوەندی ئەورروپاش لە (4.25%)بۆ(3.25%)ی دابەزاند، هەروەها هەر یەك لە بەنكە ناوەندییەكانی كەنەدا، و سوید، و چین، وسویسرا هتد، بەهەمان كار هەڵسان.

3-ئاراستە كردنی لێشاویكی پارەی زۆر بەرەو بەنك و بۆرسەكانەوە، بە ئامانجی چارەسەر كردنی نەبوونی پارەی ژێر دەست (السیولة)، لەو بانكانەش:

ا-بەنكی ناوەندی ئەورروپا بە بڕی(69) ملیار یۆرۆی لێشاوی بۆرسەكانی كردووە.

ب-بەنكی ناوەندی ژاپۆن بری ( 14.2) ملیار دولاری لێشاوی بۆرسەكەی كرد.

ج-بەنکی ناوەندی روسیا بری (37) ملیار دولاری لێشاوی بەنکەکانی کرد.

د-بەنکی ناوەنی چین بری(586)ملیار دولاری لێشاو کرد بۆ پاڵپشتی ئابووری وولاتەکەی.

هەروەها بۆ دەرباز بوون لەو قەیرانە، لە (2009/11/5) وەزارەتی خەزێنەی ئەمریکا لە واشنتۆن کۆنگریەکی بە هەماهەنگی لەگەڵ زانکۆی هارڤارد لە بارەی سیستەمی دارایی ئیسلامی سازدا، کە زیاتر لە (100) ئابووریناس و شارەزا لە بواری بەنکەکان لەو کۆنگریە دا بەشداریان کردووە بە مەبەستی تاوتوێ کردنی سیستەمی دارایی ئیسلامی تاکو بتوانن وەلاتەکەیان لەو قەیرانە دەرباز بکەن.

سەرای ئەمانەش واچاوەروان دەکرێت ئەو قەیرانە بۆ ماوەی (2-3) سال بەردەوام بێت.

## نۆیەم

## هۆیەکانی قەیرانی دارایی لە دیدی سیستەمی ئیسلامی دا

هۆیەکانی قەیرانی دارایی 2008 لە دیدی ئابووری ئیسلامیدا بۆ ئەم هۆیانەی خوارەوە دەگەرێتەوە:

1-هۆی سەرەکی ئەو قەیرانە بۆ سوو(الربا) دەگەرێتەوە. واتە بوونی سوود لە سەر قەرزەکانەوە کە ئەمەش لە دیدی ئابووری ئیسلامی دا حرامە، و مامەڵە پێکردنی قەدەغەیە هەروەك لەم ئایەتەدا روون کراوەتەوە. (وأحل الله البيع وحرم الربا)(البقرة، الاية:275).

2-کەسەکان کاڵا دەفرۆشن ئەو کاڵایە بوونی نییە، وکاڵاش دەکڕێت بەبێ ئەوەی پارە بدات، ئەمەش لە ئیسلامدا حەرامە.

3-مەسەلەی ئەخلاقی، دیارە سەرەتای سەرهەڵدانی ئەو قەیرانە بۆ نەمانی مەسەلەی رەوشت دەگەڕێتەوە. چونکە مامەڵەی دارایی لە سەرمایەداریدا بریتییە لە بەدەستهێنانی قازانجی تاکە کەسی، وقازانجی خێرا وقازانجی زۆر، کە ئەمەش لە سەر حیسابی فەرامۆش کردنی رەوشتی ئابووری بەدەستی دەهێنن، واتە بە بێ گوێ دان بە رەوشتی کۆمەلگا. لێرەدا ناتوانرێت مەسەلەی رەوشت فەرامۆش بکرێت، هەر وەکو پیغەمبەرمان(دروودی خوای لە سەر بێت) دەفەرمووێت (إنما بعثت لأتمم مكارم الأخلاق).

4-پروپاگەندەی ناراست وهەڵبەستراو، ئامانجەکەی زیان گەیاندنە بەو کەسانەی مامەڵەکان ئەنجام دەدەن، هەروەها زیان گەیاندنە بە بازاڕ وئابووری، بۆ نموونە پروپاگەندەی ئەوە دەکرێت، کەکۆمپانیای (ا) زەرەری کردووە، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی نرخی پشکەکانی لە بۆرسەدا هەرەسبهێنێت، لەم بارەیەوە پێغەمبەرمان(دروودی خوای لە سەر بێت) دەفەرمووێت (كبرت خيانة أن تحدث أخاك حديثا هو لك به مصدق، وأنت له به كاذب)(رواه أحمد وأبو داود).

5-مامەڵەکانی بۆرسە قومارکردنێکە لە سەر درۆ و فێڵ لێك کردن دامەزراوە، بۆیە ئیسلام رەتی دەکاتەوە، لەم بارەیەوە پێغەمبەرمان(دروودی خوای لە سەر بێت) دەفەرمووێت

(أياكم وكثرة الحلف في البيع، فإنه ينفق ثم يمحق).

6-ئاراستە کردنێکی نا تەندروست بۆ دارایی وەك خەرجکردنی لە بواری جوانکاری و زێدەخۆری و جەنگ لەلایەن حکومەت وکۆمپانیاکانەوە.

7-وازهێنان لە سیستەمی زێڕوگۆڕینی بۆ دراوی کاغەزی بەبێ هیچ رووپۆشراویك لە زێڕ .

## دەیەم

## چارەسەری ئەو قەیرانە لە دیدی ئابووری ئیسلامیدا

چارەسەر قەیرانی دارایی لە میانەی ئەم خاڵانەی خوارەوە ئەنجام دەدرێت:

1-لەرێگەی زەکاتەوە جێبەجێ دەکرێت، کە بریتییە لە یەکێك لە کۆڵەگە سەرەکییەکانی ئیسلام، هەروەها زەکات پەیگەیەکی سەرەکییە لە ئابووری ئیسلامیدا.

2-سیستەمی دارایی و ئابووری لە ئیسلامدا، پشت بە ریسای هاوبەشی لە قازانج و زەرەر دەبەستێت.

3-ئابووری ئیسلامی هەموو مامەڵەیەکی وەهمی حەرام کردووە، و رەتی دەکاتەوە.

4-ئابووری ئیسلامی ئابوورییەکی خوایی و ئابووریەکی مرۆڤایەتییە، ئەمەش هەموو لایەنەکانی بەرهەمهینان وبەکاربردن وئالوگۆری ودابەش کردن دەگرێتەوە.

5-هەموو شێوە ودەقەکانی فرۆشتنی قەرزی بە قەرز حەرام کردووە. وەك داشکانی کاغەزە داراییەکان، وحەرامکردنی لە خشتەدانەوەی قەرز.

6- وازهێنان سیستەمی سوو(الربا) لە سەر قەرز وسپاردە، وهێنانە کایەوەی سیستەمی پارەدارکردنی هاوبەش. لەم بارەیەوە پیغەمبەرمان(دروودی خوای لە سەر بێت) دەفەرمووێت: (لعن الله آكل الربى وموكله وشاهديه وكاتبه: وقال: هم سواء).

7-دەرباز کردنی مامەڵە نەختییەکان لە ژێر رکێفی دولاری ئەمەریکی، بەجۆریك لە کاتی هەرەسهێنانی دولار نەبێتە هۆی هەرەسهێنانی دراوەکانی تر.

8-بنەمای سیستەمی دارایی وئابووری ئیسلامی لە سەر ئاسانکاری بۆ قەرز دامەزراوە، واتە ئەگەر قەرزار نەیتوانی قەرزەکەی بداتەوە، ئەوا دەبێ چاوەڕێی بکرێت، هەر وەکو خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز دا ئاماژەی پێکردووە(وإن كان ذو عسرة فنظرة إلى ميسرة وأن تصدقوا خير لكم إن كنتم تعلمون)﴿سورة البقرة / الآية: 279﴾ کە ئەمەش خۆی مانای بوونی ئابووری ڕەوشت بەرز دەگەیەنێت لە ئیسلامدا.

9-ئاراستە کردنی وەبەرهێنانەکان بەرەو پرۆژە گرنگەکان بۆ پاراستنی مرۆڤ لە هەموو روویەکەوە، و دوور کەوتنەوە لە زێدەخۆری و بەفیڕۆدان.

10-دوور خستنەوەی هەموو شێوەکانی قورغکاری چ ئەوەی لە لایەن کەس ودامەزراوە دارایی و نەختیییەکانەوە، یاخود لەلایەن دەوڵەتەوە ئەنجام دەدرێت.

11-دامەزراندنی بازاڕی کاغەزە داراییەکانی ئیسلامی، کە هەموو بنەماکانی ئیسلامی تێدا پەیڕەو بکرێت.

12-هێنانەکایەوەی پەیماننامەیەکی ئەخلاقی بۆ مامەڵە داراییەکان لە سەر ئاستی جیهان، ئەویش لە چوارچێوەی پەیامە ئاسمانییەکانەوە، وهەموو وولاتانیش پێوە پابەندبن، بە شێوەیەك هەر وولاتێك یان دامەزراوەیەکی دارایی سەرپێچی بکات، سزای بخرێتە سەر.

13-دامەزراندنی بازاڕی هاوبەشی ئیسلامی لە نێوان وولاتانی ئیسلامیدا، ودەرچوون لە دروشمەکانەوە بۆ کاری پراکتیکی.

14-بایەخی زیاتر بە بیری ئابووری ئیسلامی بدرێت، بە تایبەتی لە بواری بەنك و مامەڵە داراییەکان، ولە سەر ئاستی زانکۆ و پەیمانگاکان.

## یانزەهەم

## دەرخستەی قەیرانی دارایی

قەیرانی دارایی جیهانی دوو لایەنی گرنگی بەدەر خست ئەوانیش بریتی یە لە:

1-وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە سەر بناغەیەکی پتەو و سەقامگیر دانەمەزراوە.

2-لەرزۆکی سیستەمی ئابووری جیهانی (ئەوروپا، ژاپۆن، چین) و نە توانینی لە سەر بەدەستهێنانی کیانێکی ئابووری پتەو، کە بتوانێت کێبرکیی وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بکات، چونکە بە لەرزینی بازاڕی ئەمەریکی بووە هۆی لەرزینی ئابووری ئەو وولاتانە و نەیان توانی چارەسەرێك بۆ خۆیان بدۆزنەوە.

## دوانزەهەم

## چۆنیەتی خۆ دوور گرتن لە دووبارە بوونەوەی قەیرانەکاندا

لێرەدا چەند پێشنیارێك خراوەتە ڕوو، کە وولاتان لەم جۆرە قەیرانە دوور دەخاتەوە:

1-دەتوانرێت بۆ بازاری پشکەکان، ریگە بە وەبەرهێنەکان بدرێت پرۆسەی جامبازی خێرا ئەنجام بدەن، بەلام لە سنووریکی دیاریکراودا، واتە رادەیەك بۆ ئەنجامدانی مامەڵەکان لە رۆژێکدا دیاری بکرێت.

2-پەیرەوکردنی سیاسەتی باج بە جۆریك کە هانی وەبەرهینان لە سەرمایەیی ماوە کورت نەدات، بۆ ئەوەی کۆنترۆلی دیاردەی جامبازی خیرا بکرێت.

3-ئازادکردنی بازاڕ به شێوەیەکی داڕێژراو له ڕووی یاسا وئیجرائاتەکانەوه، وبەشێوەیەکی له سەرخۆ.

4-پێویسته بەنکی ناوەندی دەستتێبخات له کاتی ئیفلاسبوونی بەنکه گەورەکاندا، له ڕیگەی دابین کردنی پارەی ژێر دەست و ڕاستکردنەوەی داراییدا.

5-پیادەکردنی شەفافیەت، چونکه زۆر پێویسته بۆ به دەستهێنانی متمانەی وەبەرهێنه بیانی وناوخۆییەکاندا.

6-زاڵ بوون به سەر دیاردەی هەڵئاوسان له کاتی بەرز بوونەوەی ڕێژەکەی.

7-پێدانی سەربەخۆیەکی زیاتر به بەنکی ناوەندی، واته دەست تێوەر نەدانی حکومەت له کاروباری بەنکی ناوەندییەوه، که بریتییه له پیادەکردنی سیاسەتی نەختی.

8-چاککردنی سیستەمی پاداشتی خاوەن بەنکەکان و کارگێرییه باڵاکان، بەشێوەیەك ببێته هۆی بەهێز کردنی چالاکییەکانی ئەو بەنکه.

9-گرنگی دانی حکومەتی وڵاتانی جیهانی سێیەم به عەقلانیەتی خەرجییەکانی حکومەتەوه به هەموو شێوەکانییەوه، و ڕیگرتن له بەفیڕۆدانییەوه.

10-دروست کردنی دامەزراوەی بازرگانی حکومی دەرەکی و چالاککردنی، بۆ ئەمەش سوود له ئەزموونی چین وەربگیرێت.

11-چاودێریکردنی بۆرسەکان و ڕیگه گرتن لەو کەسانەی که مشەخۆری بۆرسەکانن، یان سنورێکیان بۆ دابنرێت.

12-زیاد کردنی ئاراسته بەرەو وەبەرهێنان له بواری ئابووری ڕاستەقینەدا، وەك کشتوکاڵ و پیشەسازی.

13-چاو خشاندنەوە بە رەفتار و سیاسەتەکانی سندوقی نەختی نێو دەوڵەتی وبەنکی نێودەوڵەتی و ریکخراوی بازرگانی جیهانی، کە بۆتە هۆی زیاد بوونی هەژاری لە جیهاندا.

## سیانزەهەم

## دیدی چەند کەسایەتێکی رۆژئاوا لە هەمبەر سیستەمی دارایی ئیسلامی یەوە

لێرەدا بیرورای چەند کەسایەتێکی وولاتانی رۆژئاوا لە بەرامبەر قەیرانی دارایی جیهانی و چارەسەرکردنی دەخەینە روو، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە:

1-بوفیس فانسون: سەرنووسەری گۆڤاری چالینگز تیایدا بابەتێکی لە ژێر ناونیشانی (پاپا یان قورئان) نووسیوە،لە میانەیدا پرسیار لە رەفتاری سەرمایەداری ورۆڵی مەسیحی دەکات، وەك ئاین و کەنیسەی کاسۆلیکی لە رێپێدان بە نرخی سوود،هەروەها ئاماژە بەوە دەکات،کە سیستەمی ئابووری دامەزراو لە سەر مامەڵە کردن بەنرخی سوود،جیهانی بەرەو نەهامەتی کۆمەڵایەتی ترسناکی هەژاری و دەوڵەمەندی بێسنوور و هەژانی گەورەی ئابووری بردووە.

ئەمە وفانسون لە کۆتایی ووتارەکەیدا پێشنیار بۆ پاپای فاتیکان بندیکتی شانزەهەم دەکات ودەڵێ(وای بۆ دەچم کە ئیمە لەو قەیرانەدا زیاتر پێویستمان بە خوێندنەوەی قورئان بێت لە جیاتی ئینجیل بۆ تێگەیشتن کە چیمان لێ دێت وچی بە سەر بەنکەکانمان دێت،ئەویش لە بەر ئەوەی ئەگەر هاتبایە ئەو کەسانەی بەنکەکانمان بەریوە دەبەن بیریان لە فەرمایشت و یاساکانی قورئان بکردایە و

جێبەجێیان بکردایە تووشی کارەسات و قەیرانەکان نەدەبووین و نە دەگەیشتینە ئەو بارە خراپە،ئەویش لە بەر ئەوەی پارە، پارە ناهێنێتە دەست).

2-رۆڵان لاسکین: سەر نووسەری ڕۆژنامەی(لوجورنال دفینانس)ی فەرەنسی لە(2008.10.4) نووسیویەتی:

(پێویستە شەریعەتی ئیسلامی لە بواری دارایی وئابووری پەیرەو بکەین، بۆ دانانی سنووریك بۆ ئەو قەیرانە کە بازارەکانی جیهانی هەژاندووە.لە ئەنجامی یاریکردن بە ڕێساکانی جامبازی وەهمی یاساغ). ئەمە و لاسکین لە درێژەی نووسینەکەیدا کە لە ژێر ناونیشانی (ئایا کاتی ئەوە هاتووە وول ستریت بنەماکانی شەریعەتی ئیسلامی وەربگرێت) نووسیویەتی(ئەو نەهامەتییانەی، کە سەرمایەداری هێناویەتیە ئاراوە بە تایبەتی قەیرانی دارایی ئیستا پێویستی ئەوە دەردەخات،کە بەدوای ئەگەری بەدیل دابگەڕین بۆ خۆ دەربازکردن لەو بارەدا، لە نیو ئەو ئەگەرانەش پەیرەو کردنی شەریعەتی ئیسلامی دێت لە مامەڵە داراییەکاندا، کە دژە لەگەڵ داب ونەریت وئاینی رۆژئاوا).

3-لۆریتا ناپلیونی: لەم دوایەدا کتێبێکی بە ناونیشانی (اقتصاد ابن اوی) بڵاوکردەوە،تیایدا ئاماژە بە گرنگی پارەدارکردنی ئیسلامی دەکات، ورۆڵی لە دەربازکردنی ئابووری رۆژئاوا.لەم بارەیەوە ناپلیۆنی دەڵێ (بەرپرسیاریەتی ئەو بارە نائاساییەیی کە ئابووری جیهانی تیدا دەژی، دەر ئەنجامی بڵاوبوونەوەی گەندەڵی وجامبازییە لە بازارەکاندا،کە بۆتە چەند جار بوونەوەی کاریگەرە ئابوورییەکان). هەروەها ئەوەش روون دەکاتەوە، کە(لەوانەیە بەنکە ئیسلامییەکان ببنە بەدیلی لەبار بۆ بەنکە رۆژئاواییەکان،ئەمە ولەگەڵ هەرەسهێنانی بۆرسەکان و قەیرانی

قەرزەکان لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەم رۆژانەدا، سیستەمی بەنکی تەقلیدی تووشی چەقبەستووی بووە وپێویستی بە چارەسەری بنەرەتی و قوڵ هەیە.

4-ئالن گرینزبان: فەرمانرەوای بەنکی فیدرالی ئەمەریکی لە ماوەی (20)ساڵی رابردوودا، کەبە ئەندازیاری سەرمایەداری هاوچەرخ دادەنرێت، لە(2008.10.23) لە بەردەم کۆنگریسی ئەمەریکا لە ئەنجامی قەیرانی دارایی جیهانی دانی بە نووشوستی هێنانی سیستەمی ئابووری سەرمایەداری نا،کە لە سەر بنچینەی تیوری بازاری ئازاد دامەزراوە تیایدا بانگەشەی ئازادی ئابووری رەها دەکات.

## سەرچاوەکان

1-حسين حسين شحاتة، الازمة المالية اثارها والدروس والعبر المستفادة منها،الموقع(www.darelmashora.com)، بتاريخ(2009.10.10).

2-ياسر محمد قاسم باسردة، الازمة المالية العالمية وتاثيراتها على البنوك الاسلامية، معهد العلوم الاقتصادية وعلوم التسيير، الملتقى الدولي الثاني(يومي5-6ماي 2009).

3-زهية كواش، فتحية بن حاج حيلالي مغراوة، الازمات المالية وعلاقتها بسعر الفائدة، معهد العلوم الاقتصادية وعلوم التسيير، الملتقى الدولي الثاني(يومي5-6ماي2009).

4- زغدار احمد، ناصر المهدي، الازمة المالية الاسيوية والازمة العقارية الامريكية... الاسباب والدروس المستخلصة من الازمتين، معهد العلوم الاقتصادية وعلوم التسيير، الملتقى الدولي الثاني(يومي5-6ماي2009).

5- وليد احمد الصافي، الازمة المالية العالمية 2008 طبيعتها، اسبابها، تاثيراتها المستقبلية على الاقتصاد العالمي والعربي، معهد العلوم الاقتصادية وعلوم التسيير، الملتقى الدولي الثاني(يومي5-6ماي2009).

6-زايدي عبدالسلام، مقران يزيد، الازمة المالية العالمية و انعكاساتها على الاقتصاديات العربية، معهد العلوم الاقتصادية وعلوم التسيير، الملتقى الدولي الثاني(يومي5-6ماي2009).

7-برايان كويل، نظرة عامة على الاسواق المالية،ت: دار الفاروق، الطبعة الثانية، دار الفاروق للنشر والتوزيع، القاهرة،2007.

8-عصام فهد العربيد، الاستثمار بورصات الاوراق المالية بين النظرية و التطبيق،الطبعة الاولى،دار الرضا للنشر، دمشق،2002.

9-عبدالحكيم مصطفى الشرقاوي، العولمة المالية وامكانات التحكم عدوى الازمات المالية، الطبعة الاولى، دار الفكر الجامعي، الاسكندرية، 2005.

10-زياد رمضان، مروان شموط، الاسواق المالية، الطبعة الاولى، الشركة العربية المتحدة للتسويق والتوريدات، القاهرة، 2007.

11-محمد سامر القصار، الازمة المالية العالمية،الطبعة الاولى، دار الفكر، دمشق، 2009 .

12-واثق حمد ابو عمر،النظرية المعاصرة لمحفظة الاوراق المالية والتداول في البورصات العالمية،الطبعة الاولى،دار الرضا للنشر،دمشق،2003.

13-الداوي، الشيخ، الازمة المالية العالمية، انعكاساتها وحلولها، مؤتمر الازمة المالية العالمية وكيفية علاجها من منظور النظام الاقتصادي العربي والاسلامي، جامعة الجنان، طرابلس، لبنان، (13-14) آذار 2009.

14-حازم الببلاوي،الازمةالمالية الحالية محاولة للفهم، الموقع-(www.iid-alraid.de) بتاريخ(2009.12.7).

15-برايان كويل، الحماية من مخاطر العملة، الطبعة الثانية، دار الفاروق للنشر والتوزيع، القاهرة، 2008.

16-جيرالد بوكسبرغر، هارالد كليمتا، ترجمة عدنان سليمان، الكذبات العشر للعولمة بدائل دكتاتورية السوق، الطبعة الاولى، دار الرضا للنشر، دمشق، 1999.

